# ڕەمەزاننامە
## نووسینی: سەنگەر حەسەن نەجم


چاپی یەکەم ٢٠٢٤ - ١٤٤٥ک

نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر ـ شەقامی ٣٠مەتری تەنیشت منارەی چۆلی
+964 750 818 08 65
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice \

ئامادەکردنی پێڕست - نووسینگەی تەفسیر
نەجم، سەنگەر حەسەن
ڕەمەزاننامە، سەنگەر حەسەن نەجم (نووسەر)،
١٨٨ لاپەڕە،
١٤* ٢١ سم
بابەت، ئایینی، ڕەمەزان
ISBN: 978-9922-679-43-3

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان/
هەرێمی کوردستان، ژمارە سپاردنی (--)ی ساڵی (٢٠٢٤)ی پێدراوە.

"بیروبۆچوونی ئەم کتێبە، مەرج نییە هەمان بیروبۆچوونی نووسینگەی تەفسیر بێت"

دیزایین: نووسینگەی تەفسیر

## (زنجیرەی سفر)
## دڵخۆشی و ئامادەکاری بە بۆنەی مانگی ڕەمەزانی پیرۆزەوە.

حەزرەتی نازدار ﷺ بەر لەهاتنی ڕەمەزان ئامادەکاری تەواوی کردووە بۆ ئەم مانگە، ئەمەش هەر لە زۆر بەڕۆژووبونی بگرە لەمانگی شەعباندا تا دەگاتە موژدەی هاتنی ئەم مانگە بە یاوەران. ئیمە کە دەڵێین: ئامادەکاری کردووە، بەدڵنیاییەوە سێ سەد و شەست پلە جیاواز لە ئێمە، چوون ئامادەکارییەکانی ئیمە لە کڕینی کەل و پەلی زیادە هەتا دەگاتە قۆرخ کردن و ...، ئەو وەکو لە عەبدوڵڵای کوڕی عەباس وەسفی کردووە: وكان أجودَ ما يكون في رمضان حين يلقاه جبريل. وكان يلقاه جبريلُ في كل ليلة من رمضان، فيدارسه القرآن، فَلَرَسولُ الله حين يلقاه جبريل أجود بالخير من الريح المرسلة.(١)

حەزرەتی عومەر لەپێشـوزای ڕەمەزانـدا بێ وێنە بوو، ئەو یەکەمین کەسێك بوو کە ڕووناکییەکانی مزگەوتی حەزرەتی نازداری دادەگیرساند، هەر ئەویش بوو خەڵکی بۆ نوێژی تەڕاویح

(١). صحيح البخاري.

لە مزگەوت کۆکردەوە، و بەم جۆرەش مزگەوتی بە نوێژ و قورئان خوێندن ڕووناك کردەوە. تەنانەت حەزرەتی عەلی دوعای بۆ کردووە، کاتێك لەیەکەم شەوی ڕەمەزان چۆتە دەرەوەو بینیویەتی مزگەوت بە ڕووناکی ئەدرەوشێتەوە و قورئانی تێدا دەخوێنرێت، فەرموویەتی: (نور الله لك یا ابن الخطاب في قبرك کما نورت مساجد الله بالقرآن).(١)

حاڵی پێشەوایان و زانایان لە ڕەمەزاندا ئەو حاڵە نەبووە کە لەمانگەکانی تردا تیایدا ژیاون، ئینجا هەرکەسێك بەجۆرێك پێشوزای لەم مانگە کردووە، ئەوەتانێ مامۆستا سەعیدی نورسی دەڵێت: "بەبۆنەی هاتنی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز، پڕ بەڕۆح و ویژدانمەوە پیرۆزبایتان لێدەکەم، دەپاڕێمەوە لە (أرحم الراحمین) ئەم دوعایانەتان گیرابکات کە لەم مانگەدا دەیکەن".(٢)

لەلای خۆشماندا، هەر لە ئێوارەی ٢٩ی شەعباندا پێشوازی ڕەمەزان لە چاوانی گەڕەك و کۆڵانە جوانەکان بەدی دەکرا، بەوەی هەواڵی هاتنی ڕەمەزان و بینینی هیلال، هەموو شوێنێکی تەنیبوو. ماڵەکان پاك دەکرانەوە و ڕووناکییەکانیان دادەگیرساند و لە هەمووشی خۆشتر، هەر ماڵە بانگ نامەیەکی ڕەمەزانی هەڵدەواسیو ڕۆژانە هێڵیان بەسەر ژمارەکاندا دەهێناو ئێمەیش سەیری هەموویمان دەکرد و زۆربەی کاتەکانیمان لەبەر کردبوو،

(١). کنز العمال.

(٢). رسائل النور – الملاحق – ص ١٥٧.

بەنموونە کەی پارشێو دەبێت و لە پانزەی ڕەمەزان چی لێدێت و لە کۆتـایی ڕەمـەزان کـەی بـانگی ئێـوارە دەدات و تەنانـەت جـەژن دەکەوێتــە چ ڕۆژێــك، ئینجــا لەســەر دەفتــەرەکانی مەکتــەب دەماننوسی "مانگی ڕەمەزانی پیرۆز".

پشتیوان بەخودا لەم زنجیرەی "ڕەمەزاننامە" لەگەڵتان بەردەوام دەبین بۆ ئەوەی، بەڵکو بتوانیت گەر سوودێکی بچووکیش بێت، بیگەیەنین و بۆ ئێمەیش ببێت بە توێشوو. ڕەمەزانتان پیرۆز بێت و خــودای گــەورە یارمــەتیتان بــدات لــە کردنــی عیبادەتــەکان و سەرکەوتووتان بکات.

## یەکەم
## وشەی "رمضان"

وشـەی (ڕەمـەزان) بەرامبـەر مـانگی ڕەمـەزان بـەکاردێت کـە مانگی نۆیەمی ساڵی قەمەڕی دەکات و بەدوای مانگی شەعبان دا دێت و ڕۆژەکانی عادەتەن لەنێوان ٢٩ بۆ ٣٠ ڕۆژە، لە زمانەوانیدا ئەم وشەیە لە چاوگی "رَّمَض" وەرگیراوە، واتە: گەرمییەکی بەتین. لـە سـەردەمی نەزانیـدا ئـەم مانگـە لـە هاوینـدا بـوو، بۆیـە وای پێدەگوترا، یـانی باوەڕوایـە کاتێـك کـە نـاوی مانگـەکانیان دانـا لـە کۆنـدا، هـەر مانگـە و بـەگوێرەی بارودۆخەکـە نـاودەنرا، ئـەم مـانگی ڕەمەزانەش کەوتە نێو وەرزی هاوین، بۆیە وا ناونراوە.

(شِدَّةُ الحَرِّ وَوَقْعُ الشَّمْسِ على الرَّمْلِ والحِجارَةِ) کاتێك تیشکی خۆر لـە لمـی بیابانەکـەی دەدا، وای پێـدەگوترا:... (مطـر يـأتي قبـل الخريـف فيجـد الأرض حـارة محترقـة). هـەروەها بـەو ناوچانـەش دەگـوترا: کـە بـارانی بـەر لـەپایزان لە زەوییەکەی دەدا، لە گەرمیدا هەڵمی لێهەڵدەستا.

وشـەکە تاکـە، هەریـەك لـە وشـەکانی: (رمضـانات، رماضـين، أرمضان، أرمضة، ارمُض). بریتیتن لە کۆیەکەی.

لە فەرمووده دا هاتووه کە (صَلاَةُ الأوَّابِينَ إذَا رَمِضَتِ الفِصَالُ من الضحى).[1] واتە: نوێژی ئەوابین لەکاتێکدایە، کە بەچکە وشتر لە گەرمای زەوی بێتاقەت دەبێت، کە مەبەست لەوکاتەیە خۆر تیایدا بەرز دەبێتەوە و گەرما زێتر دەبێت.

جگە لەوەش کۆمەڵێك ڕاو بۆچوونی زیاتر هەن سەبارەت بەم بابەتە، بەڵام لەنێویشیاندا و یەکێك لەبۆچوونە جوان و ڕێك و دروستەکان ئەوەیە، کە ئیمامی قورتوبی دەڵێت: بۆیە ناونراوە ڕەمەزان (رمضان)، چونکە (يرمض الذنوب = يحرق الذنوب)، واتە: گوناه و تاوان دەسوتێنێت، یان دەسڕێتەوە.[2]

(1) أخرجه أحمد في مسنده.

(2) . سەرچاوەکان: معجم الغنى، مختار الصحاح، معجم الرائد، لسان العرب.

## دووەم
## ئەگەر لە ڕەمەزاندا شەیتانەکان کەرەنتینە دەکرێن، ئەی بۆچی و چۆن هێشتاش خەڵکانێك دەتوانن گوناهـ بکەن؟!

یـەکێك لـەم پرسـیارانەی کـە عەیامێکـە لەگەڵماندایـە و گـەر بـەگوتنیش نـەبێت، ئـەوا لـەنێو نـاخمان چەکـەرەی کـردووەو چەنـدین لق و پۆپی لێکەوتۆتـەوە و ئینجا هەموو ڕەمـەزانێکیش سەرلەنوێ ئەپـدەیت دەبێتـەوە! کـەم تـا زۆر هەریـەك لـە ئێمـە سـەرنجی ئـەو فـەرموودەمان داوە کـە حـەزرەتی نـازدار ﷺ دەفـەرمووێت: (**إِذَا جَاءَ رَمَضَـانُ فُتِّحَـتْ أَبْـوَابُ الْجَنَّـةِ، وَغُلِّقَـتْ أَبْـوَابُ النَّـارِ، وَسُلْسِـلَتْ الشَّيَاطِينُ**).[1]

واتە: کە ڕەمەزان هات، ئیدی دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوە و دەرگاکـانی دۆزەخ دادەخـرێن و شـەیتانەکانیش کەلەبچـە و زنجیـر دەکرێـت، یـانی دەبەسـترێنەوە. ئێمـەیش لامـان وایـە کەسـەرچاوەی گوناهـ شـەیتانە، دەی ئەگـەر وایـە ئـەوا شـەیتانەکان لـەم مانگـەدا دەبەسـترێنەوە، بـەڵام هێشـتاش خـەڵکانێك گوناهـ دەکـەن و سـڵ

(1) روى البخاري (١٨٩٩) ومسلم (١٠٧٩).

ناکەنــەوە لەهــەر کــارێکی خــراپ! لەڕاســتیدا ئــەم پرســیارە زۆر دەمێکــە لەلایــەن گــەورە زانایــانی ئوممــەت بەچەنــدین شــێوە وەڵام دراوەتەوە، یەکێك لەوەڵامە جوانەکانیش، ئەوەی مامۆستا "شەماڵ موفتی" ڕەحمەتییە، کە ئەمەی خوارەوە پوختەکەیەتی:

بـۆچی خـەڵکی گوناهـ دەکـات لـە ڕەمەزانـدا، گـەر شـەیتانەکان بەسترابێتنەوە؟! وەڵامی ئەم پرسیارە ئەوەیە کە سەرچاوەی گوناهـ دووانە: نەفس و شەیتان. بۆنموونە: ئەوەی سەوزە و میوەی داناوە و جوانەکەی لەپێشەوەیە و گەنیوە خراپەکەت بۆ دادەنێت و فێڵت لێدەکات، وەیان هەر گاهـ بۆی بلوێ دزیت لێدەکات... ئەم جۆرە گوناهانـە کـە بـەچاو دەبیـرنێن پەیوەنـدی بـە شـەیتانەوە نییـە، ئـەوە دەروونــی ئــەم مرۆڤــە نەخۆشــە، گرفتەکــە لــەئیمان و لــەدڵی ئــەو کەسەیە کە ئەم کردارە دەکات و هیچ پەیوەندی بەشەیتانەوە نییە. کەوابوو ئێستا با بپرسین ئێمە چۆن جۆرەکانی گوناهـ جیا بکەینەوە و بەچی بزانین کە ئەم گوناهە لەشەیتانەوەیەوە و ئەوی دیکەیان لە نەفسی مرۆڤ خۆی بوو؟

لەڕاســتیدا جیاکردنــەوەیان زۆر ئاســانە، ئــەم گوناهــەی کــە "بەردەوامە و یەك جۆرە" ئەوا لەنەفسی ئینسانەوەیە، چوون شەیتان هەرگیز بەیەك جۆر گوناهـ ڕازی نییە، بەڵکو کاتێك کە گوناهێکی بچوکـت پێـدەکات هەمیشــە دوای ئــەوە لەهــەوڵی ئــەوە دایــە کــە گوناهێکی گەورەترت پێبکات.

# سێیەم
# فانۆس "فەنەر"ی ڕەمەزان

دەربـــارەی ڕووناککردنـــەوەی مزگەوتـــەکان لەشـــەودا، ڕاو بۆچوونی جیا هەن، بەتایبەت لەوەی کە ئایا یەکەم کەس کێ بوو ئەم دیاردەیەی داهێنا؟ و لە چی سەردەمێك بوو؟

لەوەدەچێت ڕاوبۆچوونەکان لەسەر ئەوە کۆك بن، کە یەکەمین کەسێك مزگەوتی بەبۆنەی مانگی ڕەمەزان ڕازاندۆتەوە، خەلیفەی دووهەمی ڕاشیدین؛ «عومەری کوڕی خەتتاب» بووە، بەڵام بەر لەئەوە با بزانین ئەی ڕووناکییەکان لەسەردەمی حەزرەتی نازدار ﷺ چۆن بوو، و مزگەوت چۆن ڕووناك دەکرایەوە؟

ڕووناککردنەوەکان لەڕێگای چرای ئاسایی بوون، کە بەفتیلەو زەیت کاری دەکرد، ئەوەی مزگەوتی پێغەمبەریش ﷺ گـڕدان و داگیرساندنی گەڵای دارخورما بوو. توێژەری گەورە ئیبن حەجەری عەسقەلانی لەکتێبەکەیەدا (الإصابة في تمييز الصحابة). ئاماژە بەوە دەدات: "مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ بەهۆی داگیرساندنی گەڵا دارخورماوە ڕووناك دەکرایەوە لەشەودا، و بەمجۆرەش تا نۆ ساڵ

هەر ئاوا بوو، تاوەکو «تميم الداري» هاتە مەدینە، و لەگەڵ خۆیدا حەبل "کندر" و چرا یان فەنەری هێنابوو لەگەڵ زەیتیش، ئەوەبوو چرا یان فەنەرەکانی هەڵواسی و بەمجۆرە مزگەوت ڕووناك بوویەوە، حەزرەتی نازدار ﷺ پێی فەرموو: (نوّرت مسجدنا نَوَّرَ الله عليك في الدنيا والآخرة). واتە: مزگەوتەکەمانت ڕووناك کردەوە، خودا دونیا و ڕۆژی دوایت بۆ ڕووناك بکاتەوە.

دیارە کە لەم سەردەمەشدا فانۆس هەر هەبووە، و شێوە پەرەسەندووەکەی چرا بووە، کە بەهۆی شووشەوە ڕووناکییەکەی زیاتر دەبوو، بەڵام بەهۆی تێچووی زۆرەوە بەکارنەبراوە. بەڵام سەبارەت بەوەی کەبەبۆنەی ڕەمەزانەوە ئەم کارە کرابێت، ئەوا وەکو سەرچاوەکان ئاماژەی پێدەدەن، بەشێوەیەکی گشتی «عومەری کوڕی خەتتاب» یەکەمین کەسێك بووە کە ئینارەی لە مزگەوت داناوە بەبۆنەی مانگی ڕەمەزانی پیرۆزەوە، هەروەك لەکتێبی "کنز العمال فی السنن والأقوال، ٢٣٤٤٧، لاپەڕەی ١٠٨٨"دا هاتووە، کە لە ئەبو «ئیسحاقی هەمەدانی» دەیگێڕێتەوە، لەیەکەم شەوی ڕەمەزان «عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب» چۆتە دەرەوە و بینیویەتی کە مزگەوت ڕووناککراوەتەوە و قورئانی تێدا دەخوێنرێت، بۆیە بە «عومەری کوڕی خەتتابی» فەرمووە: (نور الله لك يا ابن الخطاب في قبرك كما نورت مساجد الله بالقرآن). واتە: خودا گۆڕت بۆ ڕووناك بکاتەوە ئەی کوڕی خەتتاب، هەروەك مزگەوتت بە خوێندنی قورئان ڕووناك کردەوە.

دوای ئەوەی کە دیاردەکە بڵاوبۆتەوە، ئیدی هەروەك

لەسەرچاوەکان ئاماژەی پێدەدرێت هەر کەسێك و سەرکردەیەك لەناوچەکەی خۆی ڕۆڵی هەبووە، بەنموونە لەسەردەمی عەبباسییەکان جیا بووە و کەسێك دەوری گرنگی هەبووە، لەسەردەمی عوسمانییەکان بەجۆرێکی تر بووە کەوەك ئاماژەی بۆ دراوە سوڵتان «ئەحمەد» بەم کارە هەڵستاوە، بەڵام ئەوەی بەتایبەت بە "فانۆسی ڕەمەزان" دەناسرێت و شێوەکەی وەرگرتووە، ئەوا یەکێکە لەدیاردە و دەرکەوتە میللییەکانە، ئەگەرچی لە میسر هاتۆتە ئاراوە، بەڵام زیاتر بۆنێکی ئیسلامی وەرگرتووە، ئەسڵی وشەکە لە زمانی ئیغریقییەوە هاتووە بەمانای 'ڕووناککەرەوە' دێت، فیرۆزئابادی لە "القاموس المحيط" دا دەڵێت: کە ئەسڵی وشەی فانۆس بەمانای "النمام" دێت، ئەوەش بەهۆی ئەوەی کە خاوەن، یاخود هەڵگری فانۆسەکە لەنێو تاریکیدا دەردەخات.

سەبارەت بە ئەسڵی دیاردەکە

١. گووتراوە کە خەلیفەی فاطیمی، لە ئێوارەی بینینی مانگ لە میسر چۆتە دەرەوە و بۆ بینینی هیلالی ڕەمەزان و بەمجۆرەش منالآن و نەوجەوانان بە هەڵگرتنی فانۆس ڕێگەکەیان ڕووناککردۆتەوە.

٢. لە ڕیوایەتێکی تر دا هاتووە کە یەکێک لە خەلیفەکانی فاطیمی فەرمانی کردووە و کە بەدرێژایی ڕەمەزان شەقام و مزگەوتەکان ڕووناک بکرێنەوە بە فانۆس.

٣. گێڕانەوەی سێییەم ئەوەیە کە لەسەردەمی فاطیمییەکاندا

ڕێـگە نەدراوە بە ئافرەتـان بچـنە دەرەوە لە شـەودا تەنهـا لە مـانگی ڕەمەزان نەبێـت، (هەنـدێکیش دەڵـێن: ڕێگەپێـدانەکە تەنهـا بـۆ نوێژکردن بـووە)، بەمجۆرەش هەر ئافرەتێ منالێ یا خزمەتکارێکی لەگەڵ بـووە و فانۆسـێکی هەڵگرتـووە تـاوەکو پیـاوان لە دووەرەوە بـزانن کە ئەوەی دێـت بەرامبەریـان ئـافرەتە و لەسـەر ڕێگەکەیـان دوور بکەونەوە و بەمجۆرش ئەوان چێژ لە چوونە دەرەوە ببینن.

٤. بەڵام ئەوەی کەزۆر جەختی لێدەکرێتەوە ئەوەیە کە خەلیفەی فـاطیمی 'المعز لدین الله' لەشـەوی "٥ یـان ١٥" ی ڕەمەزانـی سـاڵی (٣٥٨)ی کـــۆچی گەڕاوەتەوە و بەمجـــۆرەش منـــاڵان و خەڵکـــی بەگشتی چوونەتە دەرەوە و فانۆسیان هەڵگرتووە تاوەکو پێشوازی لێـبکەن و هەم ڕێـگەکەش بەفانۆسـە ڕەنگاوڕەنگەکـان ڕوونـاک بـکەنەوەو لەمەشـەوە بۆتـە عادەتێـک و بەدرێژایی ڕەمەزان کوچەو کۆڵانەکانی میسر ڕووناککراوەتەوە.

**•سەبارەت بە بڵاوبوونەوەی**

گـــوتراوە دوای میســـر لەهەریەک لە شـــارەکانی دیمەشـــق و حەلەب و قـودس و وڵاتـانی عەرەبـی هەمـان کلتـوورو دیاردەدیـان پەیـڕەو کـردووە و وەک ڕازانـدنەوە و بەخێرهـاتن و دڵخۆشـییەک بەبۆنەی مـانگی ڕەمەزان. لەئێستاشدا، بەهەموو وڵاتـانی جیهـان و بەکوردستانی خۆشیانەوە ئەم عادەتەوە ساڵانە دووبارە دەبێتەوە[1].

(1) بەداخـەوە هـیچ سـەرچاوەیەکەم دەسـت نەکـەوت سـەبارەت بـە ڕووناکردنـەوەی

## چوارەم
## تۆپی بەربانگ و شتی تریش...

لەسەردەمی پێغەمبەری ئەزیز ﷺ خەڵکی هەر لەئێوارەوە کە ڕۆژووی دەشکاند دەستیان بەخواردن و خواردنەوە دەکرد، تا بەیانی، بەیانی یانی چی؟ یانی ئەوکات دوو بانگ دەدرا، بانگی یەکەم لەلایەن سەردارمان بیلالەوە بوو، بانگی دواتریش لەلایەن ئیبنو ئوم مەکتووم بوو.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: (إن بلالاً يُؤذِّن بليل، فكُلُوا واشرَبوا حتى ينادِيَ ابنُ أمِّ مكتوم).[1] واتە: کاتێك بیلال بانگیدا، هێشتا کاتی شەوی هەر لەبەر ماوە، کەوابوو ئێوە دەتوانن بخۆن و بخۆنەوە تا ئەوکاتەی کە ئیبنوو ئوم مەکتووم بانگ دەدا. یانی بانگی یەکەم بۆ وریا بوونەوە بوو، واتە: بۆ ئەوانەی کە خەوتوون بەخەبەر بێنەوە، وەیان ئەوانەی کە خەریکی عیبادەت و شەو نوێژن ئاگادار ببنەوە. لەفەرموودەیەکی تر هاتووە: (لا يَمْنَعَنَّ أَحَدَكُمْ

---

مزگەوتەکان بە بۆنەی مانگی ڕەمەزان لە کوردستاندا.

(١). صحيح المسلم (٦٠٦).

أَذَانُ بِـلاَلٍ مِـنْ سَحُورِهِ، فَإِنَّـهُ يُـؤَذِّنُ. أَوْ يُنَـادِي بِلَيْـلٍ. لِيَرْجِـعَ قَـائِمَكُمْ، وَلِيُنَبِّهَ نَائِمَكُم).[١]

واتـە: بانگـدانی بـیلال ڕێگـەی خـواردنی پارشـێوتان لـێ نـەگرێت، چوون کاتێ ئەو بانگ دەدات هێشا هەر شەوی ماوە، ئەم بانگە بۆ ئەوەیە هەرکەس کە لە شەونوێژدایە پشوویەك بدات و ئەوەش کە خەوتووە خەبەری بێتەوە. مەبەست لەم پێشەکییەی سەرەوە ئەوە بوو کە بزانرێت لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ کۆمەڵگاری موسڵمانان، کۆمەڵگایـەکی بچـووك بـوو، دواتـریش لـە مەککـە و مەدینـەو دەوروبەری دابوو، لەم شوێنانەی تریش کە ئیسلامی پێگەیشتبوو هـەر بـەمجۆرە بـوو، بـەڵام کـاتێ ئیسـلام بـە وڵاتـانی تـر گەیشـت و لەشـارە گـەورەکان ئـەم شـێوەیە تـا ڕاددەیـەك دەسـتی نـەدەدا، بۆیـە لەهەر شوێنە بەجۆرێك لەجۆرەکان داهێنان کراوە.

## تۆپی بەربانگ

سـەیر لەوەدایـە، کـە ئاماژەکـان ئـەوە دەڵـێن، ڕووداوی تـۆپی بـەربانگ بـە ڕێکـەوت بـووە! واتـە هـیچ پلانێـك لـەئارادا نـەبووە! پوختەکەی ئەوەیـە: لـە وڵاتـی میسـڕ و لـە سـاڵی ٨٦٥ی قەمـەڕی، سـوڵتانی مـەملوکی بـەناوی (خشـقدم)، لـەئێوارەی یەکـەم ڕۆژی

(١). صحيح البخاري (٦٢١).

مـانگی ڕەمەزانـدا، تـۆپێکی –مدفعـ نـوێی بـۆ هـاتووە و ئـەویش هەڵسـاوە بـە تاقیکردنـەوە، ڕێکـەوت وابـووە کـە کـاتی ڕۆژوو شکاندنی ئێوارە بووە، خەڵکەکە وای زانیووە کە سوڵتان بە دەستی ئەنقەست ئەوکارەی کردووە تاوەکو هەموو بزانن کە ئێستا کاتی بانگـدان و ڕۆژوو شـکاندنە! بۆیـە خـەڵکی چوونەتـە دەرەوە و بەیەکـەوە سوپاسـی سـوڵتانیان کـردووە لەسـەر ئـەم کـارە چاکـەی، ئیـدی سـوڵتانیش دەبینـێ کـە کـارەکە ئـاوای لێهـاتووە، بۆیـە بڕیـار دەدات ئیدی هەموو ئێوارەیەك تۆپی بەربانگ بتەقێنرێت![١]

## تۆپی پارشێو

دوا بـەدوای ئـەوەی کـە زانـراوە ئـەم ڕێگەیـەی تـۆپی بـەربانگ سوودێکی باشی هەیە لە ئاگادارکردنەوەی خەڵکی، بۆیە بڕیاردراوە بۆ پارشێویش هەمان شت بەکاربێت و ناو بنرێت (تـۆپی پارشێو . مـدفع السـحور)، ئـەم دیاردەیـەش هـەر لـەولاتی میسـر نەگیرساوەتەوە، بـەڵکو بەهەموو وڵاتـانی ئیسـلامیدا بڵاوبۆتـەوە و سەردەمانێکی زۆر بەکارهێنراوە، تاوەکو سەددەی بیست!

(١). مدفع الإفطار – نورا طارق

## شێوە کلاسیکییەکەی ڕۆژوو شکاندن

ڕۆژوو شکاندن لەکوردستان بەچەندین قۆناغ تێپەڕیوە، ڕەنگە سەرچاوەی تەواوم لەبەردەست نەبێت، بەڵام لێرەدا دەمەوێت وەك ئەزموونێك باسی ساڵانی نەوەدەکان بکەم، بەر لەشەڕی نەگریسی ناوخۆ کەناڵی کوردی هەبوون، ئیدی تیای بوو دەقەیك بەر لە ئەوی تر بانگی دەفەرموو، یان تیابوو ئەویتر درەنگ دەکەوت، هەرچۆنێك بێت هیچ کامێکیان لەگەڵ یەك نەبوو، هێندێك جاریش جیاوازییەکە زۆر بوو! ئەمە سەرەتای ئەوکاتە بوو کە من و ئەندامانی خێزانەکەمان متمانەی تەواویان نەبێت بە بانگدانی تەلەفزیۆن (ئەگەرچی هیچ ئیشکالێکی تێدا نییە)، بۆیە هەریەك لەئێمە لەبەردەمی ماڵەکە دەوەستا تاوەکو گوێی لەدەنگی بانگ دەبوو، لەوەش ناخۆشتر نەبوو کە کارەبا دەکوژایەوە و زۆر جار دەنگی بانگ نەدەهات، بەتایبەت لەکاتی قات و قڕییەکە و هەروەها دوای شەڕی ناوخۆ، ئەوکاتەی بۆ ماوەیەکی زۆر کارەبا نەبوو (ئەمە سەبارەت بەهەولێر، یان ئەو گەڕەکەی من تیای بوو)، لە هەمووشی سەیرتر، هەر ماڵێك بانگنامەیەك (تقویم رمضان)ی هەبوو، کە تیایدا هەموو کاتەکانی دیاریکرابوو، بەڵام ئیدی وای لێهات بوو کە هەر دەبوو خۆمان گوێمان لەبانگ بووایە، سەیریش لەوەدا بوو، هەر ئێمە وانەبووین، من کاتێ لەچاوەڕوانی بانگ

لەبەر دەرگاکە دەوەستام، دەمبینی زۆربەی کۆڵانەکە کەسێك لەبەر دەرگا وەستاوەو چاوەڕێی بانگە! ڕاستییەکەی ئەم شێوازە (کە من ئێستا ناوم ناوە شێوە کلاسیکییەکەی ڕۆژوو شکاندن)، تاوەکو ئێستاشی لەگەڵدا بێت هەر لەگەڵمادایە، نەمتوانیوە دەست بەرداری ببم! لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەڵێ شتی جوانی پێبەخشیووم، بەنموونە لەوەی چەند خولەکێك بەر لەبانگ، کاتێ لە حەوشەکە یان لەبەر دەرگاکە لەچاوەڕوانی بانگدایت، بێدەنگییەکی سەراسیمە باڵی بەسەر شاردا کێشاوە، بێدەنگییەك گوێت لەهیچ شتێك نابێت کە دەڵێیم هیچ شتێك یانی مەبەستم تەنانەت چۆلەکەکانیش کە کاتەکانی پێشتر لەسەر تەلی دارتێلەکان هەڵکوڕماون و جریوە جریویانە، ئێستا دەڵێی بەنج لێی داون! (هیوادارم کە موبالەغەیەکی ئەدەبی نەبێت) بێدەنگییەکی سەیر، مەگەر هەر تەنها بانگی ئێوارە ئەم بێدەنگگییە بشکێنێت! ئینجا عادەتەن، دەنگی ئەو مزگەوتەی کە دوورترە، زووتر دەگات، و ئیستێك دەکەم، و هێشتا دڵم ئاو ناخواتەوە، تاوەکو دەنگی تریش دەبیستم دواتر کە تەواو دڵنیا دەبمەوە ئینجا! من دەخوازم ئێوەیش تاقی بکەنەوە، یان من دڵنیام لەوەی کە زۆرێك لەئێوەش ئەم شێوەتان پەسەندە بێ ئەوەی ئاگامان لەیەکتر بێت!

## پێنجەم
## وتاری عەسران

وتاری عەسران، بۆ کاتی خۆی وەك مەوسوعە و ویکیپیدیا و کانگەی زانیاری وابوو. بە کاتێکی کەم زۆرترین زانیاریت وەردەگرت، ئینجا زۆربەی مزگەوتەکانیش، بە زنجیرە دەڕۆیشتن، واتە: وتاری عەسرانیان تەرخان دەکرد بۆ ئەو بابەتانەی کە بەیەکەوە پەیوەستن و بە تەنها لە دەرسێکدا باس ناکرێت، بەنموونە سیرەی پێغەمبەری ئەزیز ﷺ، وەیان ژیانی خەلیفەکانی ڕاشیدین، وەیان ژیانی زانایان و پێشەوایانی ئیسلام... هیتد.

لە هەموویشی گرنگتر پرسیار و وەڵام بوو، خەڵکی دەیانتوانی لەپارچە کاغەزێکدا پرسیار بۆ مامۆستاکە بنووسن و ئەویش کۆتایی وتارەکەی تەرخان دەکرد بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە، چونکە ئەو کاتیش وەك ئێستا ئینتەرنێت و وەسیلەکانی تر نەبوون، بۆیە بۆ خەڵکی بەگشتی کۆمەڵێك پرسیاری زۆر هەبوون بۆ وەڵامدانەوەیان، لەو پرسیارانەش کە زۆر دووبارە دەبوونەوە مەسەلەکانی ڕۆژوو شکاندن بوو، ئایا ڕۆژوو بەم شتە یان بەوە دەشکێت؟. هەندێکجار پرسیارەکان زۆر دەبوون، ئەوەتانێ وەکو

شـێخ "كشـك" دەگێڕێتـەوە: هـەر كاتێـك لـە كـۆلێژ تـەواو دەبـووم دەچووم بـۆ مزگـەوتێك، كـە نـاوی مزگەوتەكـە "المنفـی" بـوو، لـەوێ دادەنیشـتم دوای نـوێژی عەسر دەستم دەكرد بـە وتـاری عەسـران، و وەڵامـی پرسـیارەكانم دەدایـەوە، هەنـدێكجار پرسـیارەكان ئەوەنـدە زۆربـوون، تـاوەكو خـۆر بەئاسـمانەوە زەرد دەبـوو دادەنیشـتین و دواتریش بۆ ڕۆژوو شكاندنی ئێوارە دەچووین".[(١)]

ئەم وتارە، بەزۆری دوای نوێژی عەسر دەدرا، و ڕۆژانـی جومعە ئـەم وتـارە نـەدەدرا، بـەهۆی ئـەوەی كـە نیوەڕۆكـەی وتـاری هـەینی هـەبوو. زۆربـەی جـار كـورت و پوخـت، و هەنـدێكجاریش درێـژ دەبوویەوە. جگە لەم وتارەش لەملا و ئەولای مزگەوت هەندێكجار ئەڵقەی دەرسی شەرعی هەبوون.

چەنـد فەرموودەیـەك هـەن ئامـاژە بـەوە دەدەن كـە پێغەمبـەر ﷺ چەنـد جارێـك دوای نـوێژ وتـاری هـەبووە، و ئـەویش بەشـێوەی واعیزەیـەكی كـورت، و هـەروەها هەنـدێك لـەزانایانیش دەرسـە شەرعییەكەیان لا چاكتر بووە لە تەسبیحاتەكەی دوای نوێژ، وەكو ئیمامـی ئەحمـەدی كـوڕی حەنبـەل دەڵێـت: "هـیچ شـتێك هاوتـای زانست نییـە..."، هەربۆیـەش دەبینین زۆرێك لـە مامۆستایان هـەر دوای زیكـری "أستغفر الله" یەكسـەر دەست دەكـەن بـە دەرسـەكە، وەیەكێكی تریش لەو هۆكارانەی كە ئەم وتارە دوای نوێژی عەسر

(١). حوار ساخن مع الشيخ كشك قبل رحيله، نووسەر:محمد فوزی. لاپەڕە ٥٤-٥٥.

بوو، ئەوەبوو کە نوێژی عەسر، نوێژی تری سوونەتی لەدوا نییە... و بەتایبەتیش لە ڕەمەزان خەڵکێکی زۆر کاتەکانی خۆی بۆ خواپەرستی یەکلا کردۆتەوە و دوای نوێژی عەسریش ئەوانەی کارێکی ئەوتۆیان نییە، لەمزگەوت دەمانەوە تاوەکو ئێوارە.

زۆرجار وتاری عەسران، گرنگییەکی تری بەیان دەکرد، ئەویش ئەم ڕووداوانە بوون کە لە ڕەمەزاندا ڕوویانداون، بەنموونە لە ١٧ی ڕەمەزان باسی جەنگی بەدر دەکرا. وەیان لەگەڵ ڕۆژەکەدا ئەو ڕووداوانەی ڕوویانداوە دەخرانە ڕوو، بەنموونە وەکو ئەمڕۆ ٥ی ڕەمەزانە، با بزانین لە مێژووی ئیسلامدا چی ڕوویداوە؟

لە (٥)ی ڕەمەزاندا و لە ساڵی (١١٣)ی قەمەری، «عبدالرحمن کوری موعاویە کوڕی هشام کوڕی عبدالملك» لەدایك بووە، و بە «عبدالرحمنی داخل» دەناسرێت و ئەم لە ئەندەلوس سەرلەنوێ خەلافەتی ئەمەوی بنیات نایەوە.[1]

ئیدی بەمجۆرە بەشێوەیەکی کورت و پوخت لایەنە گرنگ و سەرنج ڕاکێشەکانی ئەم ڕووداوە وەردەگیران و دەخرانە ڕوو.

(١) . ابن کثیر (١٩٩٢). البدایه و النهایه (PDF). بەیروت: مکتب المعارف. مجلدی ٨: پەڕەی ٧٩ – ٨٠.

# وتاری عەسران لە ئێستادا

تا چەند ساڵێك بەر لەئێستا من پێموابوو بەهۆی ئەو شەپۆڵی ئینتەرنێت و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان، وتاری عەسران کاڵ بۆتەوەو ئەوەندە گرنگی پێنادرێت، ئینجا چ لەلایەن خەڵکییەوە بێت وەیان لەلایەن مامۆستا خۆی، بەڵام تەواو پێچەوانەکەی ڕاست بوو، لە ڕەمەزانی ساڵی پار (١٤٤٠ قەمەری)، لەیەکێك لەمزگەوتەکان تووشی شۆك بووم، کاتێ بینیم خەڵکێکی زۆر دوای نوێژی عەسر بۆ وتاری عەسران دانیشتن و مانەوە، مامۆستاکە کە بڕوانامەی دکتۆرای هەبوو لە شەریعەتدا، بەشێوەیەکی سادە و ساکار لە سەر عەرزەکە دانیشت و خەڵك دوورو نزیك کۆبوونەوەو دەستی بە وتاردان کرد، ئەو کە باسی خەلیفەی سێهەمی ڕاشیدی دەکرد، وەکو جاران زنجیرە وتار بوو، بەڵام باسکردنەکەی تەواو جیاواز بوو، چوون لەگەڵ هەر گێڕانەوەیەك بەیەکەوە لکاندنێك هەبوو لەنێوان ژیانی خەلیفە و ئێستا و ئەمڕۆی ئێمە، ئەو زیرەکانە ڕووداوەکانی لێك دەدایەوە، من دوایی بۆم دەرکەوت کە وتاری عەسران نەك هەر کاڵ نەبۆتەوە، بەڵکو ئێستا بۆ چەند شێوەیەك گۆڕاوە، لەوانە خەڵکی بەدوای ئەو مامۆستایە دەگەڕێن کە پێویستیانە، یانی بەنموونە مامۆستا هەیە لەم ڕەمەزانە باسی سیرە

دەکات، و منیش پێویستم بەوەیە گوێبستی دەرسی ئیعجازی بم، ئیدی بەدوای ئەو مزگەوت و مامۆستایە دەگەڕێم کە باسی ئیعجاز بکات، وەیان بەدوای ئەوەدا دەگەڕێم کەباسی تەفسیر دەکات وەیان هەر باسێکی تر... ئەمە جۆرێك، جۆرێکی تر ئەوەیە بەهۆی فراوانی زیاتر جیهان و جۆرێتی ئیش و کاری خەڵکی، کەسانێك هەن بۆیان نالوێ لە عەسردا ئامادەی مزگەوت ببن، بۆیە وتاری عەسران بە ڕەزامەندی لەگەڵ مامۆستاکە گۆڕاوە بۆ وتاری دوای نوێژی تەراویح وەیان دوای نوێژی بەیانیان، ئەمانەش وەنەبێت جۆری نوێ و داهێنراو بێت، بەڵکو لەدێر زەمانەوەش دەرسی دوای نوێژی شێوان وەیان دوای نوێژی بەیانیانیش هەر هەبووە.

# وتاری عەسران لە سەردەمی کۆڕۆنادا

ئێستا، بەهۆی ئەم بارە ناهەموارەی کە جیهانی گرتۆتەوەو مزگەوتەکان بەشێوەی کاتی داخراون (هەرچەند هەواڵی خۆش هەیە لەم نزیکانە پشتیوان بەخودا بکرێنەوە)، دەبینین زۆربەی مامۆستایان وتاریان هەیە لە تەلەفزیۆن و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا، بەڵام خاڵی سەرنج ئەوەیە، کە دەبوو بەر لە ڕەمەزان ئەمەیان بە پلانێکی تۆکمە جێبەجێکردایە، واتە بەنموونە: مامۆستا کە پلانی وابوو ئەم ڕەمەزانە لەوتاری عەسران زنجیرە وتارێکی هەبێت سەبارەت بە بابەتێکی دیاریکراو، ئەوا دەکرا ڕۆژانە لەکاتێکی دیاریکراو، و لەڕێگەی تەلەف

زیۆن، ڕادیۆ، تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان... هیتد. ئەمە جێبەجێکرابووایە، تاوەکو ئەوکاتەش کە بارودۆخەکە ئاسایی دەبوویەوە، ئەوسا بەهەمان تەواوکاری لە مزگەوت خرابایە ڕوو، ئینجا ڕەنگە کۆمەڵێك مامۆستای بەڕێز هەر واشیان کردبێت و ئێمە ئاگادار نەبین. بەشێوەیەکی گشتیش مامۆستایان و زانایانی ئایینی ڕۆڵێکی بەرچاو و لەبیرنەکراویان هەبوو، لەم ڕەمەزانە کە ئێستا ئێمە لەسەرەتاکەی داین، نەوەك هەرئەوەش، بەڵکو نابێت

ڕۆڵــی مامۆســتا و زانایــانی ئــایینی لەڕووبەڕووبونــەوی پــەتا و ڤایرۆسـی کۆڕۆنـا لـەبیر بکرێت، لـەکاتێك ئـەوان ڕێـزی پێشـەوەی هۆشـیارکردنەوەی خـەڵکی دابـوون لـە مەسـەلەکانی خۆپـارێزی و پاکژیدا.

## شەشەم
## بۆچی ڕاگەیاندنەکان ڕێز لە مانگی ڕەمەزان ناگرن؟!

ئـەم ناونیشـانەی سـەرەوە، لـە وتـارێکی دکتـۆر «موسـتەفا مـەحموود» وەرگیـراوە، بـەناوی (بـۆچی ڕاگەیانـدنی عـەرەبی ڕێـزی مانگی ڕەمـەزان ناگرێت؟)، بـەڵام بـەر لـەوەی بچینە سـەر پوختـەی بابەتەکەی دکتۆر، با دەستپێکێك وەك پێشدەستی بخوێنینەوە.

جاران کە مانگی ڕەمـەزان دەهات، لەسـەر ئاستە جیاوازەکانی کۆمەڵگا پێشوازی دەکراو بە بەرنامە و پرۆگرامی تایبەت ڕێز لەم مانگە دەگیـرا، بـە نموونـە لەسـەر ئاسـتی حکومـەت، قایمقامییـەت بەیاننامەی دەردەکرد، بەوەی هەموو چێشتخانە و چایخانە و شوێنە هاوشێوەکانی دادەخران، مەگەر ئەوانەی کە ڕێگەپێدانیان هەبوو، ئـەویش دەبـوو پـەردەی سـپی هەڵواسـن، هـیچ کـەس بـۆی نـەبوو تەنانـەت جگـەرەش بـە ئاشـکرا بکێشـێت...هیتر. لەسـەر ئاسـتی ڕاگەیاندن هەموو ستۆدیۆکان دەگۆڕدران و تەنانەت ئەم بێژەرانەی کە لەچك بەسەریش نەبوون، لەم مانگەدا لەچکیان دەکرد (وابزانم ئەمەیان هەر نەماوە!)، لەسەر ئاستی ماڵەوەش هەروا، ئەوەی کە پێشـتر لـە مـاڵ دەکـرا، لـەم مانگـەدا یاسـاغ بـوو، وەکـو بـە نموونـە:

سەیرکردنی تەلەفزیۆن بەگشتی وەیان سەیرکردنی هەندێك بەرنامە و زنجیرە فیلم!

ئێستا با بێین پوختەی بابەتەکەی دکتۆر موستەفا مەحموود بکەینەوە کوردی[(١)]:

بۆچی ڕەمەزان لە مانگی عیبادەتەوە دەگۆڕێت بۆ مانگی ڕابواردن؟ من نەشێخم و نەبانگخواز، بەڵام ئێستا باش لەوە دەگەم، کە بۆچی دایکم لەسەردەمی منالێمدا ڕووی تەلەفزیۆنەکەی لەدیوار دەکرد! ئەوکات منداڵێکی بچووك بووم، کەدایکم نەیدەهێشت من و براکانم سەیری بەرنامە تەرفیهییەکانی تەلەفزیۆن بکەین لەکاتێکدا هەموو هاورێکانم سەیریان دەکرد، تاکە وەڵامی دایکیشم ئەوەبوو، کە: ڕەمەزان مانگی عیبادەتە نەوەك فەوازیر!. لەم کاتەدا لەو لۆژێکەی دایکم نەدەگەیشتم، و واهەستم دەکرد کە لەئایین دا توندە، بەوەی منداڵێکی بچووکی وەك من یاساغ دەکات لەسەیرکردنی تەلەفزیۆن.

دەی کێ لەئێوە ڕووی تەلەفزیۆنەکە دەکاتە دیوار لە ڕەمەزاندا، بۆئەوەی سەیر نەکرێت؟

ئیدی کاتەکان ڕۆیشتن و ژیان و خوێندن ڕاپێچی کردم بۆ ئەو سەری دونیا، تاوەکو وەڵامی ئەم پرسیارەم لە پیاوێکی پیری نەخوێندەوار دەست کەوت لەم سەری گۆی زەویدا! ئەم پیاوە

(١) . د. مصطفى محمود، لماذا لا يحترم الإعلام العربي رمضان؟

کرێکارێك بوو لە وێستگەیەکی بەنزین کاری دەکرد، کە من بۆ پڕکردنی تەنکی بەنزینەکە دەچووم، عادەتەن بۆ کڕینی قاوەیەکیش لەم وێستگەیە دەوەستام. ڕۆژێك بەر لە کریسمەس (سەری ساڵ) وەکو جاران لام دایە ئەم شوێنە، کەچی ئەم کابرایەم بینی خەریك بوو قوفڵی لەدەرگای سەلاجەکان دەدا کە مادده کحولییەکانی تێدابوو. کاتێك گەڕایەوە سەر کاشێرەکە لێم پرسی:

"بۆچی قوفڵت لە دەرگای سەلاجەکە دا؟"

وەڵامی دایەوە کە: "ئەم سەلاجەیە ئەرەقی تیایە و یاساکانی ئەم ویلایەتەش فرۆشتنی مادده کحولییەکان لەشەو و ڕۆژی سەری ساڵدا قەدەغەدەکات".

بەشۆکەوە سەیرم کرد و پرسیم: "ئەی ئەمریکا وڵاتێکی عەلمانیی نییە؟!، بۆچی دەوڵەت تەداخولی شتێکی لەمجۆرە دەکات؟".

پیاوە پیرەکە وتی: "ڕێزگرتن... پێویستە لەسەر هەمووان ڕێز بگرین لە لەدایك بوونی مەسیح و لەم ڕۆژەدا ئەرەق نەخورێتەوە تەنانەت گەر باوەڕداریش نەبیت... چونکە ئەگەر هاتوو ڕێزگرتنمان لەدەست دا، ئیدی هەموو شتێکی تر لەدەست دەدەین".

ڕێزگرتن... (ڕێزگرتن) ئەم وشەیە بۆ چەندین جار لەم مێشکم دا دەخولایەوە بە درێژایی ئەو شەوە، تۆ سەیرکە؛ مادده کحولییەکان لەزۆرێك لەمەزهەبەکانی مەسیحییەت لەئەمریکادا حەرام نییە.

بەڵام ئەم شتە پەیوەندی نییە بە حەڵاڵ و حەرام، بەڵکو شتەکە پەیوەندی بە ڕێزگرتنەوە هەیە، ئەوان وەك مێوانێك سەیری کریسمەس دەکەن کە لەساڵێکدا تەنها جارێکدا سەردانیان دەکات بۆ بیرخستنەوەی یادی مەسیح، ئەوەش هیچ ڕێزگرتنی تێدا نییە کە لەم کاتەدا مرۆ خۆی سەرخۆش بکات، و ئیدی لە کاتێکی تردا دەتوانیت ئەم شتە بکەیت و تۆ ئازادیت، بەڵام لەم ڕۆژەدا دەبێت هەموو خەڵك ڕێز بگرن و ویلایەتیش یاسای تایبەتی بەوە داناوە.

دەی منیش هیوا خوازم کە ڕێز لە مانگی ڕەمەزان بگرین، و بزانین سەیری چی دەکەین. هەرکەسێکیش شتێك بۆ خودا جێبهێڵێت، خودا چاکتری پێدەبەخشێت. ﴿ ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ شَعَـٰٓئِرَ ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقْوَى ٱلْقُلُوبِ ﴿٣٢﴾ ﴾ الحج: ٣٢.

واتە: (هەرکەسێکیش ڕێز بۆ دروشم و بەرنامەکانی خودا دادەنێت، ئەوە نیشانەی پارێزکاری و لەخواترسانی دڵەکانە).

ئێستا ئێمە لەسەردەم وسەددەیەکی تردا دەژین، کەس تەلەفزیۆنەکان لە ڕەمەزاندا ناکوژێنێتەوە، ئەمە کێشە نییە بەقەد ئەوەی کێشە ئەوەیە لە ڕەمەزاندا سەیری چی دەکەیت، دەی ئەمە تەلەفزیۆنەکانیش سانسۆرکران، چی لەمۆبایلەکان دەکەیت؟ کەوابوو خوێنەری هێژا، لێرەوە پەروەردەی دەروون دەست پێدەکات، ئێستا تۆ دەبێت درکت بەوە کردبێت کە ئەمە پەیوەندی بەوەوە نییە کەتۆ ڕووی تەلەفزیۆنەکەت بکەیتە دیوار، وەیان

مۆبایلەکەت بکوژێنیتەوە، بەڵکو ئەوەیە کە ڕێزی ئەم مانگە بگریت لەهەر شتێکدا، کە مۆبایلەکەت هەر بەهەمان شێوەی پێش ڕەمەزان بەکارهێنا یانی ئەوسا چیت کرد!

# حەفتەم
# ڕەمەزان و ڕۆژوو، لە ئەدەبیاتی کوردیدا
# -بەشی یەکەم

مامۆستا «عەبدولکەریمی مودەڕیس»

ئەدیبانی کورد، سەرقافڵەی شەکرە زمانن، ئەوان کە باپیرانی ئێمەن، تاکە پارێزەری نەتەوە و نەتەوایەتین. ئێمەی کەم تا زۆر بەکارەکانیان ئاشناین، بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت کاری ئەوان هەر تەنها شیعر نووسین نەبووە! ئەوان زانایانی ئەم نەتەوە داماوەبوون، و لەسەردەمی خۆشیاندا کورد لەناز و نیعمەتدا بوو، مەگەر ئەوەنەبێت کە هەر بەدەستی خۆمان هێنابێتمانەوە سەر سفر، دەی هەر کوردیش وتویەتی، دار پوازی لەخۆی نەبێت هەزار ساڵە. لە ڕەمەزاننامەی ئەمڕۆ باسی ڕۆژوو دەکەین، لەکتێبی (بارانی ڕەحمەت)ی مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیس.

سەبارەت بە ڕۆژوو وەکو ڕوکنێکی ئیسلام، مامۆستا بەسادەیی بۆمان ڕوون دەکاتەوە کە کەی ڕەمەزان دەست پێدەکات، و کێ بۆی هەیە هیلالی ڕەمەزان ببینێت و شایەتی کێ وەردەگیرێت؟.. تەنانەت ئەگەر هات و ئەوکەسە بە تەنیا مانگ

ببینێت چی بکات باشە؟.

له چـوارەم فەسـلاَ ڕوکنـی چـوارەمین
ڕۆژووی ڕەمەزان لەسـەر ئەهلـی دیـن
فەرز ئەبـێ ڕۆژووی مـانگی ڕەمەزان
بە تەواو بـوونی سـی ڕۆژەی شـەعبان
یـــاخود پیـــاوێکی ئـــازادی تەواو
مـــانگی یەک شـــەوە ببینـــێ بە چـاو
کـــاتێ لای قـــازی شـــــەهادەتی دا
بەو شـەهادەتەیش قـازیش حـوکمی دا
فەرز ئەبێ ڕۆژوو لەسەر خاس و عـام
بینـا بە حـوکمی مەحـکەمەی ئیسـلام
یـــا بە تەواتـــور ئەگەر هـــاتە جـــێ
بینینـی مـانگی یەک شـەوەی ئەو جـێ

***

هەرکەس بە تەنهـا خـۆی مانـگ ببینـێ
لەســـەر خـــۆی فەرزە نـــیەت بهێنـــێ
بـــۆ هەرکەسـێکیش پێـــی بـــاوەڕ بکـــا
قســـەی ئەو کەســـە ســـیرایەت ئەکـــا

لەســـەر نیشـــانەیش ئەدرێ ئیعتـــیهاد
لەبـــۆ هەرکەســـێ بکـــا ئیعتیقـــاد
نیشـــانە وەکـــوو تـــۆپی نێـــو شـــاران
ئـــاگری ســـەر کێـــو چـــرای منـــاران
«رمـــلي» ئەڵـــێ شەخســـی حیســـابگەر
حیســـابی بـــۆ خـــۆی باشـــە و مـــوعتەبەر

پاشـان سـەبارەت بەسـوونەتی ڕۆژوو مامۆسـتا بەشـێوەیەکی جـوان، ناسـك، ڕوون و سـادە بـەیانی ڕۆژوو، و ئەحکامـەکانی کردووە. وەکو بەنموونە بەیانی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ کە باس لەپەلەکردن دەکات لە ڕۆژوو شکاندن، وەیان ڕۆژوو شکاندن بـە خورمـا، وە ئەگـەر خورمـا نـەبوو چـی؟ هـەروەها سـەبارەت کاتەکانمان بەئاگابوون و زیندووکردنەوەی شەوانی قەدرو شتی تریش، وەکو ئەوەی بۆچی شەوی قەدر دیاری نەکراوە، بێگومان بۆئەوەی مرۆ زیاتر هەوڵ و کۆشش بکات، هەروەها سوونەتێکی تر ئەوەیە پێچەوانەی بەربانگ کە دەبێت پەلەی لێبکرێت، ئەوا پارشێو دەبێت تا دەکرێت تاخیر بکرێت، کە ئەمەش سوونەتی حەزرەتی نازدارە ﷺ، مامۆستا سەبارەت بە سوونەتەکانی ڕۆژوو دەڵێت:

تەعجیلی ئیفتار شەرعەن سوننەتە
کە خورما نەبوو ئاو بێمننەتە
لە جەماعەتا نوێژی تەراویح
جێبەجێ بکە بە نەهجی سەحیح
بە شەو بێدار بە هەتا ئەتوانی
مەخسووس شەوانی نیوەی پایانی
«لیلة القدر»یش زۆر بەناوبانگە
خێری ئەوەندەی یەک هەزار مانگە
لە تاقەکانی دە ڕۆژەی ئاخیر
لە سەری هەیە حەدیسی زاهیر
بۆیە گوم کرا وەختی بە تەعیین
زۆر کۆشش بکەی بۆ ڕەفتاری دین
ئەعلای سوننەتی مانگی ڕەمەزان
سەدەقە و خێرە و خوێندنی قورئان
حەزرەتی خاتەم وەکوو بای شەماڵ
خێری ئەگەیی بە شەخسی بێحاڵ
تەئخیری پارشێو هەروا سوننەتە

سەراسەر فەزڵ و خێر و حیکمەتە

هــەروەها جگەلــە ســوونەتەکانی ڕۆژوو مامۆســتا باســی خۆپارێزی دەکات، بەیانی ئەم وتەیە دەکات کە دەڵێت: خەڵکێك هەیە تەنها برسێتی و تینوێتی و هیلاکی بۆ دەمێنێتەوە! ئەمەش بەهۆی ئەوەی کە هیچ یەکێك لەئەندامانی لاشەی ناپارێزێت، با بچینە لای شیعرەکە:

ئەمە بوو زاهیر ئادابی ڕۆژوو

ئەمما پێت ئەڵێم حاڵی ببە زوو

ڕۆژووی حەقیقی بۆ گشت ئەعزایە

چوون غایەی ڕۆژوو خێر و تەقوایە

باش بپارێزە دەم و گوێچکە و چاو

لە قسە و باس و نەزەری خراو

بە دەست و بە پێ قەت زەرەر نەدەی

ئیحسانی ڕۆژووت بە بادا نەدەی

دڵت بە یادی خوا ئاوا بێ

دەمت مەشغووڵی زیکری خوا بێ

ئەوەندە بنوە گیانت ڕەحەت بێ

ئیتر با ئیشت هەموو تاعەت بێ

خۆلاسە ڕۆژوو خاسی خوایە

«الصیام لي» مەعناکەی وایە

ئەگەر ڕەمەزان وا ببەیتە سەر

ئەگەی بە ڕەزای خەللاقی ئەکبەر

کەی ڕۆژوو واجب بوو لەسەر موسڵمانان، ئیمامی نەوەوی لە (المجموع) ئاماژە بەوە دەدات کە ڕۆژوو لە ساڵی دووەمی هیجری و لەمانگی شەعبان لەسەر موسڵمانان واجب بوو، و هەروەها پێغەمبەر ﷺ بۆ ماوەی نۆ ساڵ بەڕۆژوو بووە، یانی دوای واجب بوونی ڕۆژوو، نۆ ڕەمەزانی بینیوە. لە (بارانی ڕەحمەت) دا مامۆستا لەوەلامی ئەم پرسیارە دا دەڵێت:

ڕۆژوو واجب بوو لە مانگی شەعبان

گەڕا بە قیبلە کعبة الرحمان.

هەروەها لەپرسیاری ئەوەی کە شەرتی ڕۆژوو چییە؟ و ئەوشتانە چین کە ڕۆژوو دەشکێنن، هەر لەمەسەلەی دەرزی لەخۆدان، و تادەگاتە تۆز و دوکەڵ و کلی چاو، و خۆ ڕشانەوە و چەندانی تریش بەوردی شیعرەکە بخوێننەوە، کۆمەڵێك زانیاری چاکی تێدایە:

شەرتی ڕۆژووە نیەتی ئینسان

به شەو بۆ ڕۆژووی ڕۆژی ڕەمەزان

نابێ هیچ عەینێ بە ڕۆژا بڕوا

بە خاڵیایی ئەندامی تۆدا

وەکوو کراکە و برناخ و گەروو

سک، بەر و دوا، حاڵی ببە زوو

زەرەری نییە بە دڵ نەلەرزی

بگاتە ڕەگت دەرمانی دەرزی

هەم بێزەرەرە دەرمانی ئەجزا

با تەئسیر بکا لە مۆخ و ئەعزا

چونکی سک نییە بە عورف و عادەت

«مغني» ببینە و وەربگرە حیکمەت

بەڵێ کە دەرزی گەییە نێوی سک

ڕۆژوو ئەشکێنێ بەبێ شوبهە و شک

زەرەری نییە تۆزی سارا و دەشت

تەئسیری کلیش کە چاوت پێ ڕەشت

دووکەڵی کوورەیش بە قەدەر عادەت

نەک هی جگەرەی تاڵی پڕ بیدعەت

پارێز لە عەمدی جیماع و ئینزال
خۆ ڕشانەوە شەرتە بێ جیدال
جیماعی عەمدی بۆ شەخسی فاعیل
قەزا و کەفارەت پێی ئەبێ حاسیل
ئازاد کردنی عەبدێکی بە دین
لە عەیبی عەمەڵ سالم بێ و ئەمین
جا ڕۆژووی دوو مانگ لەپاش ڕەمەزان
ئیفتاری ڕۆژووی نەیەتە ناویان
ئینجا نان دانی شەست کەسی میسکین
بۆ هەر یەکێکیان موددێ، قووتی ژین

ئێستا کۆمەڵێك پەیدابوون، کە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بە ئارەزوومەندانە دەزانن، یانی ئەوەی کە بەدڵی خۆتە، ئەگەر حەز دەکەیت بەڕۆژووبە، وەگەرنا ئاساییە! بەلێکدانەوەی خۆشیان ئەمە تەفسیری ئایەتی قورئانە! بەڵام مامۆستا ڕەتکردنەوەی و ئینکاری کردنی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان وەکو گوناهی کەبیرە (تاوانە گەورەکان) سەیر دەکات، بەهۆی ئەوەی ئەم کەسەی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان ڕەتدەکاتەوە مانای وایە کە ڕوکنێکی

ئیسلامی ڕەتکردۆتەوە:

یاخود ئینکاری ڕۆژووی ڕەمەزان

یا حەجی بەیتی کعبة الرحمن

لە ئیسلامدا کۆمەڵێك ڕووخسەتی ئەوەیان پێدراوە کە بەڕۆژوو نەبن، با بپرسین کێن ئەو کەسانەی کە دەتوانن بەڕۆژوو نەبن، مەرجەکانی چین، بەوردی ئەم شیعرەش بخوێنەوە:

ڕۆژوو نەگرتن تەجویزی ئەدرێ

بۆ موسافرێ دوو مەنزڵ ببڕێ

هەم بۆ نەخۆشی بە ئێش و ئازار

ئیجازە هەیە شەرعەن بۆ ئیفتار

هەروەها حائیض هەم شەخسی مەحسوور

بۆ ئیشی گران ناچار بێ و مەجبوور

«تحفە» بهێنە و بیخوێنەرەوە

ئەم مەقسوودانە لێک بدەرەوە

لەپاشا قەزا بەبێ کەفارەت

لازمە بۆیان بەپێی شەریعەت

ژنی حامیلە یا ژنی شیر دەر

بۆ حەملْ و منالْ ببینێ زەرەر

فەرزە لەسەریان ئیفتار و قەزا

فیدیەش لازمە بۆ ئەجر و جەزا

پیر و نەخۆش و پیاوی شلەپەت

هەر فیدیە ئەدەن بیگرە گوێچکەت

لەبارەی ئەوەی کە دەبێت فیدیەی ڕۆژوو بدات:

هەرکەس تەفرەی دا قەزای ڕۆژووەکان

هەتا بێتەوە مانگی ڕەمەزان

قەزای لە سەرە و فیدیە بۆ فەقیر

هەر ڕۆژێ موددێ بێتوول و تەقسیر

تیکراری هەیە بە تیکراری سالْ

کە فەوتا قەزا لەپاش ئەووەلْ سالْ

سەبارەت بە کەفارەتی ڕۆژوو بۆ مردوو، یانی مردوو کە ڕۆژووی لەسەر بوو ئێمە کەس و کاری چی بەکەین؟ مامۆستا بەمجۆرە حوکمەکەی بەیان دەکات:

مردوو بۆ ڕۆژوو ئەگەر قەرزار بێ

زوو چاری بکەن نەک گورفتار بێ

ڕۆژووی بۆ بگرێ خزم و خوێشی خۆی

یا بڵێین بە یەکێ ڕۆژوو بگرێ بۆی

یا بۆ هەر ڕۆژێ موددێ لە تەعام

بدا بە داماو لە باتی سیام

بۆ نوێژی فەوتاو برای بە ئەدەب

عیلاجی نییە بە ئەسڵی مەزهەب

بەڵام بە قەوڵی قەدیمی ئیمام

قەزای جائیزە بەوێنەی سیام

«قفال» نەقڵ ئەکا لە برێ ئەسحاب

لەبۆ هەر نوێژێ موددێ بە حیساب

وەجهێکیش هەیە موختارە لەلا

گەلێ ئەسحابی شافیعی والا

وەلی کەفارەت بدا بە ئیتعام

لە بۆ نوێژەکەی بەوێنەی سیام

تەقلیدیان ئەکرێ بۆ نوێژ و ڕۆژوو

کەفارەت ئەدرێ گەلێ زوو بە زوو

ئەگەر تاڵبی بۆ ئاسانی کار

قیمەتی تەعام بدەی بە هەژار

تەقلیدی ڕەئیی حەنەفییەکان

ئەم ئیشە سەختەت بۆ ئەکا ئاسان

دواجار باس لە ڕۆژووی سوونەتیش دەکات، جگە لە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان:

ڕۆژووی سوننەتیش گەلێ ئیحسانە

باعیسی قەدر و قورسی میزانە

شەش ڕۆژی شەوال لەپاش ڕەمەزان

نۆ ڕۆژەی ئەووەڵ لە مانگی قوربان

مەخسووس عەرەفە بۆ غەیری حەجاج

لەبۆ ڕۆحی تۆ ئەبێ بە میعراج

نۆهەم و دەهەم لەگەڵ یازدەهەم

لە ڕۆژەکانی مانگی موحەڕڕەم

سیازدە و چوارە و پازدەی بەناوبانگ

سێ ڕۆژەی ئاخر لە ژمارەی مانگ

ڕۆژی دووشەممە لەگەڵ پێنج شەممە

باعیسە لە بۆ خەیر و مەرحەمە

غەیری ئەمانەیش کراون بەیان

بڕۆ بپرسە لە عولەماکان

سەرجەمی ئەم شیعرە ناسکانە لە کتێبی (بارانی ڕەحمەت)دا هاتوون، ئەم شیعرانە بەجۆرێك نووسراون، کە بۆ لەبەرکردن ئاسان بن، و بەمەش ئەو خوێنەر لەپرسیارە زۆر دووبارە بووەکان دەپارێزێت، جێگەی ئاماژەشە، ئەم شیعرانە لەلایەن فەقێیانی کورد زۆر دەمێکە بۆتە بەرنامەیان و لێویان هەمیشە بەم شیعرانە تەڕە، چوون ئەوانە گەنجینەی پڕ بایەخی کوردەواری و یادگاری زانایانی کوردن.

پشتیوان بەخودا لەباسی داهاتوو تیشك دەخەینە سەر هەردوو وشەی (ڕەمەزان و ڕۆژوو) لە شیعری شاعیرانی کلاسیکدا.

# هەشتەم
# ڕەمەزان و ڕۆژوو، لە ئەدەبیاتی کوردیدا
# «شاعیرانی کلاسیك» - بەشی دووەم

بۆ ڕەمەزاننامەی ئەمڕۆ هەر لەنێو دیوانی شاعیرانی کلاسیك دەمێنینەوە، بزانین ئاخۆ شاعیرانی کلاسیك چۆن بە چ جۆرێك باسی (ڕەمەزان و ڕۆژوو)یان کردووە! دیارە هەردوو وشەی (ڕەمەزان و ڕۆژوو) بەچەندین مانای ڕاستەقینە و مەجازی بەکارهاتوون، هەندێکیان لەشیعری ئایینیدا و لەوەسف و سەنای ئەم مانگە و بەڕۆژوو بوون و شتی تر، وەهەندێکیشیا سێبەری مێتافۆڕیان هەڵگرتووە و، کۆمەڵێك غەزەلی زۆرمان هەن ئەم دوو وشەیان بەکاربردووە.

ئەگەر لەدەستپێك شیعرە ئایینییەکان وەربگرین، دەبینین ئەوانیش دابەش دەبنە سەر چەند جۆرێك، هەندێك لەوانە بەشێوەی سەنای ئەم مانگە گەورە، وەیان تیایەتی باسی ئەوانەی کە بەڕۆژوو نابن و مایەپووچن، و هەروەها شتی تریش...

«شێخ ئەحمەدی کۆر»

«شێخ ئەحمەدی کۆر» لە (شەو دێ لە عومرم ژکەم دەبێ، جا چۆن دڵم پڕ غەم نەبێ؟)دا دەڵێت:

قەت نوێژ و ڕۆژوو ناگری، بۆ کاری دنیا حازری

پێت وایە قەت قەت نامری، جا چۆن دڵم پڕ غەم نەبێ؟

هەر «شێخ ئەحمەدی کۆر» لەباسی ئەوانەی نوێژ ناکەن، وەسفیان دەکات بەوەی کە ڕێگرن لەبەردەم ڕۆژووگرتنیش، لەقەسیدەی (سوبحان لە شاهی غەففار) دا دەڵێت:

دەنەڕێنێ و بانگ دەکات

کوانێ تاریک الصلاة

کوانێ تارک الصلاة

مانیعی ڕۆژو و زەکات

«بەختیار زێوەر»

«بەختیار زێوەر» ڕەخنە لەو کەسە دەگرێت کە بەڕۆژووە و لەلایەکیش فێڵ و تەڵەکە دەکات، ئەو لەقەسیدەی (گریمان پارەت هەزار کلوور بێ) دا دەڵێت:

گریمان کاسب یا دووکاندار بی

خەریکی سەودا و جوابی کڕیار بی

بە دیمەن چاک و پاک و هەژاربی

بۆ نوێژ و ڕۆژوو ئێجگار بەکار بی

ئەگەر کەوتیتە فێڵ و دەس بڕین

لە تۆ چاکترە ڕێگری بێ دین

«دیوانی مەزڵووم»

لە «دیوانی مەزڵووم»دا، لە شیعری (خەفەت دڵمی برژان وەک کەباب)، باس لەوانە دەکات کە گاڵتە بە ڕۆژوو، و عیبادەتەکانی تر دەکەن:

قەشمەری بە نوێژ، گاڵتە بە ڕۆژوو

ئیستیهزا بە حەج، زەکات و مەولوو

عەرەق خواردنی ئەمەند لا جوانە

قاپێکی بە دەس، دووی لە گیرفانە

بۆ خۆی زەرەرو بەڵا ئەسێنێ

هەر بە دەستی خۆی دین ئەدۆڕێنێ

«لوتفی»

«لوتفی» لە شیعری (ئەوا کۆچی کرد مانگی ڕەمەزان) دا باس لەوانە دەکات کە بەڕۆژوو نەبوون، و ئەوا مانگی ڕەمەزانیش بەرەو کۆتایی دەچێت و ئەوانیش ئیدی خەسارەتمەند و مایەپووچ مانەوە:

ئەوا کۆچی کرد مانگی ڕەمەزان
ئەو کەسەی خواردی ئەو بوو پەشیمان
بێ بەش لە خەیری ڕۆژوو بوو ئەو کەس
ئەو ڕەنج خەسار بوو لە هەر دوو جیهان

جگە لەمانەش، چەندین شاعیرانی تر بەشێوەی جیا جیا هەر دوو وشەی (ڕەمەزان و ڕۆژوو)یان لەشیعرەکانیان بەکارهێناوە، و هەریەکەش بە جۆرێك و مەبەستێك، ئەم شیعرانەی خوارەوە گوڵچنینێکی خێران لەنێو دیوانی ئەم شاعیرانە، تیایەتی غەزەلە و تیایەتی هەجوو، و هەروەها چەندان بابەتی تر... لەکۆتایی شیعرەکە ئاماژە دیوانی شاعیر و ناوی شاعیرەکەش کراوە:

١. «ئەحمەد موختار جاف» دەڵێ:

کەی خوا توججارە، خوا گەورە و غەفوور و عادڵە

چۆن لەگەڵ عەبدا حیسابی قەرزی ڕۆژوو و نوێژ ئەکا[١]

٢. «ئەحمەدی کۆر» دەڵێ:

ئەکل و نەوم و شورب زۆر کەمتر بکەم با ڕۆح و جان
گەر بەبێ شەرعی نەبێ ڕۆژوو و نەمازان کەم حەرام[٢]

٣. «ئەخۆل» دەڵێ:

وەک باوک مردوو سەرتاپا ڕەشپۆش
وەکوو ڕۆژووان بێ خورد و بێ نۆش[٣]

٤. «ئەسیری» دەڵێ:

خۆشەویستیی تۆ نەبێ بۆ کەسێ هیچ کەڵکی نییە
نوێژ و تاعات و ڕۆژوو، سەد حەج و سەرفترە و زەکات[٤]

---

(١) دیوانی ئەحمەد موختار جاف (یار بە ماچی لێوی خۆی زامی دڵان سارێژ ئەکا).
(٢) دیوانی ئەحمەدی کۆر (خۆش بە حاڵی عاشقانت، دڵ لەسەر زەوق و کوئووس).
(٣) دیوانی ئەخۆل (فیدای یارێک بم قەدرزانم بێت).
(٤) دیوانی ئەسیری (یا محمد مەدەدێ).

**٥. «جەوهەری» دەڵێ:**

**بە ڕۆژوو بووم لە بۆ ئیفتار لە مزگەوت چوومەوە ماڵێ**
**کوتم برسیمە چێشت و نان و چایی حازرە با بێ**
**لە جوابدا پێی کوتم کابانی ماڵێ چارەسازێ کە**
**نە قەند و چا و ڕۆنت ماوە، نەوتیش حەو درەم نابێ**
**لەجێی نان گۆزەیەک ئاو داندرا وەک دەوری ئەسحابان**
**کوتم ڕەببی شوکر یا ڕەب کە تۆ نەیدەی ئەویش نابێ[(١)]**

**٦. «حاجی قادری کۆیی» دەڵێ:**

**تا بزانێ کێ نوێژی کرد و ڕۆژووی گرتووە**
**بۆ سیاسەت کردنی پەنجا نیگەهبان دادەنێ[(٢)]**

**٧. «حەمدی» دەڵێ:**

**گوێ لە تەزویر و ڕیا و ئەفسانە مەگرن ئەسڵی دین**
**هەر زەکاتە و ڕۆژووە و حەج فەترە ئیمانی دەخیل[(١)]**

---

(١) دیوانی جەوهەری، (قەسیدێک دادەنێم شیعری فەسیح و ساف و غەڕڕا بێ).
(٢) دیوانی حاجی قادری کۆیی، (وا دیارە ڕەسم و قانوونێکی دەوران دادەنێ).

٨. «حەمدی» دەڵێ:

دەرنەکەوتی بۆیە بەم جەژنە بە ڕۆژوو مامەوە

جەژنی من جەژنانەیی تۆ بێ بە ماڵ و جانەوە[٢]

٩. «حەمدی» دەڵێ:

تەماشای عاقیبەت کە بۆ بەد و نیکی عەمەل زاهید

شەوی بەزمم نەتیجەی سوبحە ڕۆژی ڕۆژووت شامە[٣]

١٠. «حەمدی» دەڵێ:

لە بەینی زلف و ڕووی ئەو شۆخەدا دڵ سائیمولعومەرە

نییە ئیفتاری ڕۆژوویێ شەوی بێ موتتەسیل ئیمساک[٤]

(١) دیوانی حەمدی، (پڕ گوڵە و عەنبەر وەتەن خاکی وەکوو جامی بلوور).

(٢) دیوانی حەمدی، (من لە عالەم چوومە دەرچیمە بەسەر ئینسانەوە).

(٣) دیوانی حەمدی، (لە دنیادا ئەوی باقی بمینێ نیک و بەد نامە).

(٤) دیوانی حەمدی، (لە دڵما ئەو بتە دڵتەنگ بوو چابوو شەعبدەی ئەفلاک).

١١. «حەمدی» دەڵێ:

زەمانێکە بە ڕۆژووم بەو ئومێدەی هەر دەڵێم بیکەم
لە قورسی ڕوومەت و عەننابی لێوت بەڵکە بەربانگێ[١]

***

١٢. «سابیری» دەڵێ:

قاپی ئەگری یەعنی ڕیازەتمە بەڕۆژووم
سەر قاپی پلاو زیرە و کشمیش و کەبابە[٢]

١٣. «سابیری» دەڵێ:

عومرێکە بە ڕۆژووم و نەبوو جەژنی سیامێ
بەدبەختم و نەمدی لە شەوا قەدر و بەراتێ[٣]

١٤. «سەیفولقوزات» دەڵێ:

هیلالی ئەبرۆت چونکە نەبینرا
جێژنمان تێک چوو، ڕۆژوو نەگیرا

(١) دیوانی حەمدی، (لە بورجی پەرچەمی کێدایە بەرقی داوە لاجانگێ).
(٢) دیوانی سابیری، (ئەی دڵ بە بەڵا سابیر و خوشنوود و ڕەزا بە).
(٣) دیوانی سابیری، (جانا لە هەناسەی دەمەکەت بۆنی شیفا تێ).

ڕۆژووشم بێ تۆ لێ قەبووڵ نابێ
سەرفترەش بدەم، سەرم چا نابێ
نوێژ و ڕۆژووی تۆ یاخودا قەبووڵ بێ
جێژنت مبارەک، حەجت وسووڵ بێ[١]

١٥. «سەیفولقوزات» دەڵێ:

نوێژ و ڕۆژوو و حەج، سەرفیترە و زەکات
خەتم و تەهلیلە و خێر و حەسەنات[٢]

١٦. «شاهۆ» دەڵێ:

نە ڕۆژووم ڕۆژوو، نە نوێژم نوێژە
سەریان لێ تێک دام ئەفکارم گێژە[٣]

١٧. «عارف عورفی» دەڵێ:

(١) دیوانی سەیفولقوزات، (زۆر توولی کێشا عەزیز هیجرانت).
(٢) دیوانی سەیفولقوزات، (ئەگەر دەپرسی باسی ئەو ناوە).
(٣) دیوانی شاهۆ، بەرگی دوو. یا حەی یا قەییوم بەندە هەر تۆم هەی).

ماهی ڕۆژوو ڕۆژوو گەر بشکێ گوناهی من نییە
ڕۆئیەتی قەوسی هیلالی تۆیە ڕۆژوو شەو باتیلە[١]

١٨. «عارف عورفی» دەڵێ:

لە نوێژ و ڕۆژووا سەد بارک الله
ئەدایان بردە سەر نۆبەی قەزایە[٢]

١٩. «قانع» دەڵێ:

بەڕۆژوو بووم برۆم دی وامەزانی مانگە بۆم دەرکەوت
ئەبینم شۆڕشی مانگە، لە ناو دێوانەکانی شەرع[٣]

٢٠. «عاصی» دەڵێ:

وونە چەند حزبی نەفام و دوژمنی یەکتر هەموو
تەرکی نوێژ و تەرکی ڕۆژوو وا لە ناوتان بۆتە باو[١]

---

(١) . دیوانی عارف عورفی، (یار و دەسبەرداری لێی کارێکی خەیلێ موشکیلە).
(٢) دیوانی عارف عورفی، (لە گشت لاییێکی دونیادا هەرایە).
(٣) قانع، باخچەی کوردستان، (لە مەی نۆشیم ئەگەر مەنعم بکەن مەئموورەکانی شەرع).

**٢١. حەزرەتی «نالی» دەڵێ:**

**صائم الدهری بەڕۆژ، ئەمما بەڕۆژووی بێنییەت**
**قائم اللیلی سلووک، ئەمما سلووکی بێنوێژ!**[٢]

**٢٢. حەزرەتی« نالی» دەڵێ:**

**بێنییەتی تەقبیلی دەمت عاتیلە ڕۆژووم**
**بێ حەزرەتی میحرابی برۆت باتیلە نوێژم**[٣]

**٢٣. «ویساڵی» دەڵێ:**

**زیاتر لە لوتفی حەزرەتی باری**
**نیمە بە غەیری یەک تاقە مانگا**
**سێ ڕۆژە ئەویش وەکوو ڕەمەزان**
**هەر بە ڕۆژووە، هیچ نییە بیخوا**

(١) دیوانی عاسی، (بۆ ئامۆژگاری).
(٢) دیوانی نالی، (هەی کەرێکم بوو، چ پەیکەر؟ تەیکەری هەوراز و لێژ).
(٣) دیوانی نالی، (دەورانییە وەک هێڵەکی سەودا سەری گێژم).

صائم الدهره، قائم الليله

ڕوو لە تاعەتە، خوا لێی قوبووڵ کا

مەشغووڵی سەوم و سلووکە دائیم

قەت غافڵ نییە، وەک کاکە ئەوزا

مەشهوورە ڕۆژی ئیلیاس و خدر

ئەویش ئەیگرێت بە نیازی کا

پێی ئەڵێم وا تۆ مردی لە برسا

ئەڵێ لێم گەڕێ جارێ قەیناکا

ڕۆژوو ناشکێنم تا لە واژەوە

ئاشنا و کوێخا بۆم نەنێرن کا

وەختێ کام بۆ هات ڕۆژوو ئەشکێنم

لە وەختێ ئیفتار ئەخوێنم دوعا[١]

٢٤. «حەمدی» دەڵێ:

ماهی ڕەمەزان هاتنی ئەووەڵ بە شەوم دی

تا ڕۆیی لەبەر مەستی وەهامزانی خەوم دی[٢]

---

(١) (دیوانی ویسالی، (گوێ بگرە لە من ئەی بادی سەبا).

(٢) دیوانی حەمدی، (ماهی ڕەمەزان هاتنی ئەووەڵ بە شەوم دی).

# نۆیەم
# خوێندنەوە لە ڕەمەزاندا
# (ئایا خودا ئەمری کردووە بە، بەڕۆژووبوونی عەقڵ؟!)

مانگی ڕەمەزان چەندان تایبەتمەندی هەیە، کە جیای دەکاتەوە لەمانگەکانی تر، ئەو تایبەتمەندییانەش وەنەبێ شتانێکی دەستکرد و بینراوی سادە بن، بەڵکو ئەم شەکرە مانگە وەك یوسف لەنێو براکانی دەگەشێتەوە. لەمانگەدا زۆرینەی خەڵکی بەگشتی ڕوودەکەنە خوێندنەوەی قورئان، چونکە هەروەك گوتراوە ئەمە مانگی قورئانە، ئەمەش بەحوکمی ئەوەی لەم مانگەدا قورئانی پیرۆز دابەزیووە. زۆرینەی خەڵکی واز لەخوێندنەوەکانی تر دەهێنن و ڕوودەکەنە خوێندنەوەی قورئان، بەجۆرێك لێرەو لەوێ گوێیان لێدەبێت کە خەڵکانێك هەیە بەماوەیەکی زۆر کەم خەتمی قورئان دەکات، تیایەتی هەموو سێ ڕۆژ جارێك و تیایەتی هەفتانە و وەیان هیچ نەبێت چەند خەتمێك دەکات تاوەکو کۆتایی مانگی ڕەمەزان، لەگەڵ ئەوەشدا بەدەگمەن دەبینین کە خەتمی قورئان بەتێڕامانەوە (تدبر) بکات لەم مانگەدا !

هەروەها خەڵکانێکی زۆر سوونەتەکان پێش واجبی خوێندنەوە دەخەن! ئیمامی شافیعی دەڵێت: وەرگرتنی زانیاری لە نوێژە

ســوونەتەكان چـاكترە. كــەوابوو تــۆش ســەرنج بــدە یەكــەم دەستپێكردنی ئیسـلام و لـەمانگی ڕەمەزانـدا بریتیـی بـوو لـە (إقـرأ. بخوێنە) نەوەك (صلي. نوێژبكە) وەیان (اعتكف. ئیعتیكاف) بكە، بەرلـەوەی بچینـە سـەر كۆمـەڵێك پـرس وڕا و نـاوەڕۆكی بابەتەكـە، دەمـەوێت بڵـێم مەبەسـت لەمـە كـەم خوێندنـەوەو فەرامۆشـكردنی قورئــان نییـــە، بـــەڵكو هانـــدانی زیـــاتری خوێندنەوەیـــەتی بـــە تێگەیشتنەوە، لەگەڵ ئەوەشدا یەكەم كێشە دێتە پێشمان ئەوەیە كە لە ڕەمەزاندا بەنموونـە كـێ تاقـەتی خوێندنـەوەی هەیـە، وەیـان هـەر هۆكارێكی تر ...

بایەلۆژی خوێندنەوە لە ڕەمەزاندا

جارێ بەر لە هەموو شتێك با بێینە سەر بایەلۆژیی خوێندنەوە لەم مانگە دا، بەوەی خوێنەر پاساوی ئەوە نەهێنێتەوە كە تینوێتی وەیان برسێتی دەبێتە هۆی ڕۆیشتنی تەركیز و وەیان تێنگەیشتن و بێتاقەتی، چوون ئێمە گەر ئاوڕێك لەمێژوو بدەینەوە، و بەتایبەت مێـژووی ئیســلام، دەبینـین چەنـدین كـاری گرنـگ و بنـەڕەتی و داهێنـانی گـەورە لـەم مانگـەدا بوونـە، كـەوابێت چۆن دەكرێت ئـەم مانگە لەمانگی خوێندنەوە و داهێنان بگۆڕێت بۆ مانگی خواردن و خواردنـەوەو بەرنامەگـەلێكی بێسـوود! لەتوێژینـەوەی ئەكادیمییـە پزیشكییەكان دەركەوتووە كە زیادەی هۆڕمۆنی HDA بەدرێژایی كاتی بەڕۆژووبوون لەمانگی ڕەمەزاندا هۆكارێكە بۆ چاككردن و بــەهێزكردنی زاكیــرە! دەی كــەوابوو پێغەمبــەری نــازدار ڕاســتی

فـەرموو (صـوموا تصـحوا)، چونكـە لێـرەدا وەكـو بـەیان كـرا كـە خوێندنەوە تەندروستییە و سوودی بۆ زاكیرە هەیە (ئەمە لەڕووی جەستەییەوە)، و هەروەها ڕۆژووش هەر مەپرسن! كەوابوو لێرەدا دووتەندروستی بۆ دڵت مسۆگەر كرد!

## لەنێوان ڕۆژووی سك و ڕۆژووی عەقڵ!

لام وایـــە كەئێمـــە كێشـــەیەكمان هەیـــە لەگـــەڵ چـــەمكی بـەڕۆژووبوون! ئـەوەتانێ خـەڵكانێك عەقڵیشـیان بـەڕۆژووە، یـانی ئەوەیـە لـەم مانگـەدا وەك چۆن لـە ڕۆژدا سـك هیچی بـۆ ناچێـت و بــەڕۆژووە، ئـاوا عــەقڵیش هیچــی بـۆ ناچێـت و بــەڕۆژووە! دەی بــەڕۆژووبوونی ســك خۆگرتنەوەیــە لــە خــواردن و خواردنــەوە، بەڕۆژووبوونی عـەقڵیش خۆگرتنەوەیە لە كتێب و قەڵەم، جێگەی ئاماژەیـــە كـــە پـــەروەردگار هیچكـــات ئـــەمری نـــەكردووە بـــە بـەڕۆژووبونی عـەقڵ و بگـرە بەپێچەوانەوەیـە، چـوون هـەر ئەوەیـە مـرۆڤ لـە مەخلوقاتـەكانی دی جیادەكاتـەوە. ئێسـتا تـۆی خوێنـەر دەڵێی چی، لات وانییە هاشتاگێك دروست بكەین و لە هەموو تۆڕە كۆمەڵایەتییەكان بڵێین: نا_بۆ_بەڕۆژووبونی_عەقڵ ؟

## زەكاتی"ماڵ" و زەكاتی "عەقڵ"

لیژنـەی فـەتوا لەكوردسـتان بـۆ ئەمسـاڵ، بـۆ هـەر ملیۆنێـك تـەنا

٢٥٠٠٠ دیناری دیاری کردووە، ئەی با بزانین زانایانمان بۆ زەکاتی عەقڵ چ ڕێژەیەکیان دیاری کردووە؟ بەگوێرەی زانایانمان بێت، هەموو ئەندامێکمان لەجەستە زەکاتی لەسەرەو دەبێت بدرێت، بەم پێیەش ئەم زەکاتی عەقڵە لەکەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێت و بێگومان نووسەران، و زانایان و دانایانمان دەبێت پشکی شێر لەم زەکاتی عەقڵە ببەخشنەوە، ئینجا ئەوەی ئەم زەکاتی عەقڵە لەزەکاتی ماڵ جیا دەکاتەوە ئەوەیە، کە دەتوانرێت لەیەك کاتدا بدرێت بەچەندین خەڵکی و بێ ئەوەی لە خاوەنەکەی کەم بکات! (بۆ ئەم سێ پەرەگرافەی سەرەوە سوود لەنامیلکەی: رمضانی والقراءة، بینراوە)

**حەزدەکەم بخوێنمەوە، بەڵام دەستم لە خوێندنەوەی قورئان بەرنابێت!**

جا کێ وتویەتی پێویستە دەست لەخوێندنەوەی قورئان هەڵبگریت، بەڵکو ئەوەی هەیە کە با خوێندنەوەکانیشت لەخزمەت قورئاندا بێت، با ئیتر قورئان بەتێڕامانەوە بخوێنیتەوە، ئەوتانێ ئیبن عەباس دەڵێت: "لأن أقرأ سورة من القرآن وأرتلها وأتدبرها أحب إلي من أن أقرأ القرآن كله"، واتە: سووڕەتێك لەقورئان بخوێنمەوەو تێیڕابمێنم و تێیبگەم، خۆشەویسترە لەلام لەوەی کە هەموو قورئان بخوێنمەوە.

با لەمەوپاش کە سوورەتی یوسفت خوێندەوە، دەتوانی لەکاتە زیادەکەش ئەو کتێبانە بخوێنیتەوە کە لەسەر سوورەتی یوسف نووسراون (بێگومان چەندان کتێبمان هەیە تەنانەت بەکوردیش بە تەنها لەسەر سوورەتی یوسف نووسراون)، وەیان کە تۆ دەزانیت وا لەوشەیەك و ئایەتێك حاڵی نابیت بگەڕێرەوە بۆ تەفسیرەکان، ئینجا دەزانی ئەم خوێندنەوەی تۆ چۆن لەجۆرێك ڕۆتینەوە دەگۆڕێت بۆ چێژ و عیبادەت.

## بەخشین لە ڕەمەزاندا

ئایا دەزانی کە تۆی خوێنەر سەروەتێکی گەورەت هەیە بیکەیت بە سەدەقە لە ڕەمەزاندا، ئەم سەدەقەیە شتێکی ئاسایی نییە، پارەو پولێك نییە بەشی هەر تەنها ڕۆژێك یان چەند ڕۆژێك بکات، بەڵکو ئەم سەدەقەیە کتێبە! تۆ دەتوانی لە ڕەمەزاندا کتێب ببەخشیت، یانی تۆ دەتوانی ژیانی کەسێك بۆ هەمیشە ڕووناك بکەیتەوە، بۆ هەمیشە لە لێڵاو دەربازی بکەیت، بەخشینی کتێب بیرۆکەیەکی باشە لەم مانگەدا، ئەگەر دەزانی کە خەڵکانێك هەن پێویستیان بەپارەیە، لەوەی پێویستیان بە کتێب بێت، دەی ئەمە هەر زۆر چاکە و هەلێکی ناوازەیەو لەدەستی مەدە. تۆ دەتوانی زەکاتی سەرفیترەکە (کە بۆ ئەمساڵ لیژنەی فەتوا تەنها ٢٥٠٠ دیناری دیاری کردووە)، ئەوەی ئەندامانی خێزانەکەت، ڕەنگە نەگاتە سی یان پەنجا هەزارێك بەڵام بۆ ماڵە هەژارێك زۆر چاکە،

ئەم زەکاتی سەرفیترە بخەرە نێو زەرفی نامەیەك و ئەویش بخەرە نێوانی کتێبێك و بڕۆ بیدە بەم ماڵە هەژارە، بۆ ئەوەی کوڕەکەیان ئیتر بۆ هەتاتا ڕێگا ڕووناك بێتەوە، تاوەکو کچەکەیان ئیتر بۆ هەمیشە ڕێگای گوڵڕەنگ بێت، دەتوانی پێیبڵێیت و شەرم و تەریق بوونەوەی ناوێت "فەرموو ئەوە زەکاتی سەرفیترەیە، خودای گەورە ئێوەی خۆش دەوێت، و هەروەها ئێمەیش، ئەم کتێبەشم بە دیاری بۆ (هونەر یان هۆنیا) هێناوە، حەزدەکەم بیخوینێتەوە...". بەڵام ئامان وریابە لەجۆرو بابەت و قەبارەی کتێبەکە، و وەك خوێنەرێکی بە سەلیقە، وەك خوێنەرێکی لێهاتوو، و کارزان بڕیار بدە کام کتێبەی بۆ دەبەیت، ئەوەی کە بۆ هەتاتا خوێندنەوەی لەبەر دیدەی شیرین دەکەیت یان بەپێچەوانەوە!

## دەیەم
## ڕۆژێکی پێغەمبەر ﷺ لەڕەمەزاندا - بەشی یەکەم

زۆرینەی موسڵمانان هەمیشە هەوڵی ئەوە دەدەن کە لاسایی گەورەو بچووکی کار و کردارو گوتەو هەڵسان و دانیشتەکانی پێغەمبەر ﷺ بکەنەوە، ئینجا لەمانگێکی وەکو ڕەمەزانیش ئیدی هەر مەپرسە کە چەندە پەرۆشین بۆئەوەی بزانین کە ڕۆژەکانی چۆن ژیاوە و شەوەکانی چۆن زیندووکردۆتەوە، یان جگە لەعیبادەت، کار و کردارەکانی تری لەمانگی ڕەمەزان چۆن بوون؟

لەڕاستیدا باسکردنی وەها بابەتێك پێویستی بە مەوداو کات و بوارێکی زۆر گەورە هەیە، بەڵام ئێمە لێرەدا نامانەوێت بچینە ژێر باری ورد و درشتی هەموو شتێك بەڵکو هەر بەخێراییی گوڵچنینێك دەکەین لەگوڵستانەکەی. فەرموون خوێنەری ئەم کورتە بابەتە بن:

پارشێو

لە ڕەمەزاندا ئازیزمان ﷺ هەموو ڕۆژێك نیەتی هێناوە، و پارشێوی لەگەڵ یەکێك لەخێزانەکانی کردووە، زۆر کەم خواردنی

خواردووە، و وەیان پارشێوی بە خورما کردووە لەگەڵ خواردنەوەی هەندێك ئاو، و هەندێکجاریش لەگەڵ یاوەراندا پارشێوی کردووە. لەسەحیحیشدا هاتووە کە پارشێوی لەگەڵ زەیدی کوڕی حارثە کردووە. خاڵێکی تر ئەوەیە کە پارشێوی تاخیر کردووە.

نوێژ

دوای پارشێو نوێژی کردووە، و لەنوێژدا بەقەد ئەوەی کەسێك پەنجا ئایەت بخوێنێت ئەوەندە نوێژەکەی بوو، تاوەکو بانگی بەیانی فەرمووە، دواتر دوو ڕکات نوێژی کردووە. و لەماڵەکە چاوەڕوانی کردووە تاوەکو سەیدنا بیلال قامەتی کردووە، پاشان هاتۆتە نێو میحراب و پێشنوێژی بە موسڵمانان کردووە .

دوای_نوێژ

لەدوای نوێژ لەمزگەوتدا ماوەتەوەو زیکری خوداری کردووە تا ئەو کاتەی خۆر هەڵهاتووە، دواتر نزیکەی سێ چارەگ یان زیاتر چاوەڕێی کردووە و پاشان دوو ڕکات نوێژی کردووە، ئەوەشی فەرمووە کە هەرکەسێك ئەمە بکات وەك ئەوە وایە حەجێك و عەمرەیەکی کردبێت.

بەربانگ

بەر لەئێوارە، زیکرەکانی ئێواران و هەندێك دوعای خوێندووە، دواتر کە بانگی فەرمووە، پاشان وەکو سەیدنا ئەنەس دەگێڕێتەوە کە : (کان رسولُ اللهِ صلَّى اللهُ عليهِ وآلهِ وسلَّمَ يُفطرُ على رطباتٍ

قبل أن يصلي فإن لم تكنْ رطبات فتمراتٌ فإن لم تكن تمراتٌ حسا حسوات من ماءٍ).[1] بەربانگی بە ڕووتاب کردۆتەوە، ئەگەر ڕووتاب نەبووایە ئەوا بە خورما ڕۆژووەکەی دەشکاندا، و ئەگەر ئەوەش دەستنەکەوتایە بە ئاو. بەپێچەوانەی پارشێو، پەلەی لەبەربانگ کردنەوە کردووە و فەرموویەتی: هێشتا خەڵکی هەر لەسەر چاکەن، تا ئەوەی کە پەلە لە ڕۆژوو شکاندن دەکەن. هەروەها دوای نوێژی ئێوارە لەمزگەوت دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە، و سوونەتی دوای نوێژی لە ماڵدا ئەنجام دەدا، فەرموودە هەیە لە سەحیحی موسلیم: (إذا قَضَى أَحَدُكُمُ الصَّلاةَ في مَسْجِده، فَلْيَجْعَلْ لِبَيْتِه نَصِيبًا مِن صَلاته، فإنَّ اللَّهَ جاعِلٌ في بَيْتِه مِن صَلاته خَيْرًا).[2] واتە: ئەگەر یەکێکاتن لە مزگەوت لەنوێژ بوویەوە با بەشی ماڵەوەش بهێڵێتەوە، چونکە خوادی گەورە خێری داناوە بۆ نوێژەکانی ماڵەوەش .

لەگەڵ یەکێك لە خێزانەکانی دادەنیشت تاوەکو بانگی خەوتنانی دەفەرموو، و دواتر پێشنوێژی بۆ موسڵمانان دەکرد .

## تەڕاویح

ئازیزمان ﷺ نوێژی تەڕاویحی بە یاوەرانی کردووە لە مزگەوتدا هەرتەنها سێ جار، دوای ئەوە نەچووە، ئەمەش لەترسی ئەوەی کە

(1) أخرجه أبو داود (٢٣٥٦)، والترمذي (٦٩٦)، وأحمد (١٢٦٧٦).
(2) مسلم (٧٧٨).

بە فەڕزی نەزانن، بۆیە دوای ئەوە نوێژەکانی لەماڵەوە کردووە هەرچەندێك ویستبێتی و وەکو دیاریشە کە نوێژی درێژ کردۆتەوە. وەکو لە سەحیحی موسلیم دا هاتووە: شەوێکیان چووە مزگەوت نوێژی کرد، چەند پیاوێك نوێژیان لەگەڵدا کرد، خەڵکی بۆ سبەینێ باسی ئەو نوێژەیان کرد، خەڵك زۆرتر کۆبوویەوەو لەدوای پێغەمبەرەوە ﷺ نوێژیان کرد، بۆ سبەینێ باس لەونوێژەکرا، لەشەوی سێیەمدا ئامادبووانی مزگەوت زۆرتربوون، کاتێ هاتە دەرەوە بۆ مزگەوت نوێژیان لەگەڵداکرد، کاتێ شەوی چوارەم هات مزگەوتەکە کەسی تری نەدەگرت، پێغەمبەر ﷺ ئەو شەوە نەچوو بۆ مزگەوت کەنوێژیان بۆ بکات، بۆیە کەسانێك دەستیان کرد بەقسەکردن و دەیانوت: نوێژ، بەڵام پێغەمبەر ئەو شەوە نەچوو بۆ مزگەوت کەنوێژیان بۆ بکات، بۆیە کەسانێك دەستیان کرد بەقسەکردن و دەیانوت: نوێژ، بەڵام پێغەمبەر ﷺ نەچوو بۆ ناویان، هەتا کاتی نوێژی بەیانی هات، کاتێ نوێژی بەیانی کۆتایی هات ڕووی کردە خەڵکەکە، ئینجا شایەتومانێکی هێناو فەرمووی: (کاروباری ئەمشەوی ئێوە بەمن شاراوە نەبوو لەوەترسام کەنوێژی شەو فەرز بکرێت لەسەرتان ئێوەش نەتوانن بیکەن) لە ڕیوایەتێکی تر: ئەوە لە ڕەمەزاندابوو.

## هەر سەبارەت بە شەونوێژ و تەڕاویح

هەر سەبارەت بەشەونوێژ و تەڕاویح لەمانگی ڕەمەزاندا، ئەم فەرموودەیەش لە سەحیحی (بوخاری)دا هاتووە: پێغەمبەری خوا ﷺ

هانی دەدا بۆشەونوێژی ڕەمەزان بەبێ ئەوەی فەرمانیان پێبکات، دەیفەرموو: (هەرکەس لە ڕەمەزاندا بەبڕوای تەواو و بەهیوای پاداشتەوە شەو نوێژ بکات، خوا لەگوناهە پێشووەکانی خۆش دەبێت) هەتا پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی کردو کار بەم شێوەیە بوو، لەسەردەمی ابوبکرو سەرەتای خەلافەتی عمریشدا ﵁ هەر بەو شێوەیە بوو [مەبەست لەنوێژی تەراویحە].

## نوێژی ویتر

کاتێك لە شەونوێژ یان تەراویح دەبوویەوە بەر لەوەی نوێژی ویتر بکات خەوتووە، دایکمان عایشە لێی پرسیووە: یا رسول الله أتنام قبل أن توتر؟ قال: یا عائشة إن عيني تنامان ولا ينام قلبي.

واتە: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئایا بەر لە ئەنجامدانی ویتر دەخەویت، ئەویش فەرمووی؛ ئەی عایشە من هەر تەنها چاوەکانم دەخەون نەوەك دڵم.

## بەگشتی

لە ڕەمەزاندا بەگشتی کاتەکانی بە خوێندنەوەی قورئان، و نوێژ، و زیکر، و سەدەقە بەسەردەبرد. ئەو نموونەیەك بوو بە ئارامگرتن لەسەر برسێتی، و فێری ئوممەتی کردووە کە ڕەمەزان ئەوە نییە

کە ئێمە لەئێستا دا دەیکەین، وەکو بەنموونە بەناوی پێشوازی و خۆئامادەکردن بۆ ڕەمەزان سەلاجەکانمان پڕ دەکەین، و لەئەسڵێشدا نیوەی ئەم شتانە ناخورێت و دەبێت فڕێ بدرێت، وەیان تەنانەت گەر بخورێتیش ئەوە دەچێتە نێو بابەتی زیانگەیاندن بە تەندروستی خۆت، فێری ئوممەتی کردووە کە ڕەمەزان مانگی تەرفیهی و ڕابواردن نییە، یان تەنانەت لەکوردەواری خۆمان دەڵێن، ئەی چی بکەین چۆن ڕۆژەکەمان لێ بڕوات، وەك ئەوەی هەموو عیبادەتەکانی تەواو کردبێت! ئەو، ئەگەرچی لەترسی ئەوەی کە نوێژی تەراویح بەفەرز نەزانن ئیدی نوێژی لەمزگەت بۆ یاوەرانی نەکردەوە، بەڵام لەوەدەچێت هەر دڵی لەلای بووبێت، چوون ئەوەتا لەکۆتایی تەمەنیدا، کچەکانی و خێزانەکانی و موسڵمانانی کۆکردەوە و لەمزگەوتدا شەونوێژی بۆ کردوون. وەکو وتمان شەونوێژی کردووە، پاشان لەگەڵ ماڵ و حاڵدا بووە، و دواتر پارشێوی کردووە، و ئینجا چاوەڕێی بانگی بەیانی کردووە، دوای نوێژی بەکۆمەڵی بەیانی لەمزگەوتدا ماوەتەوە...

### بەخشین

لە ڕەمەزاندا سەرجەمی کارە خێرەکانی زیاتر و زیاتر دەکرد، لەوانەشدا خێر و سەدەقەی زیاتری دەکرد و ئاگای لە هەژاران بوو، تا ئەوکاتەی یاوەرانی وەسفیان کردوە بەوەی کە لە با خێراتر بوو بۆ بەخشین. لەفەرموودەدا هاتووە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕەمەزاندا

سەخی تر ودەس کراوە تر بوو لەماڵ بەخشیندا کاتێ کەجبریل دەهات بۆ لای، وەلەم مانگەدا لە با خێرا تر بوو لەخێر وخێرات وهەموو کار وکردەوەیەکی جوان وپەسەندداﺍ.

## یازدەیەم
## ڕۆژێکی پێغەمبەر ﷺ لە ڕەمەزاندا -بەشی دووەم

بەرلەوەی بچینە سەر خاڵە پوختەکراوەکان، دەمانەوێت ئەوە بڵێین، لە ڕەمەزاننامەی ڕابردوو چەند خاڵمان خستە ڕوو، کە هەمووی ڕەوشت و عیبادەتە بەرز و جوانەکانی پێغەمبەر ﷺ بوون، بەڵام ڕەنگە ئێستا وێنەیەك لای خوێنەر دروست بووبێت بەوەی کە پێغەمبەر ﷺ هیچ شتێکی نەکردووە تەنێ عیبادەت نەبێت! دەی لێرەوە دەمانەوێت شتێك بەیان بکەین، ئەویش ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی کردوویانەتە باو، کە مانگی ڕەمەزان کارناکەن، بەڵام کێشەکە ئەوەیە وەك چۆن کارناکەن، عیبادەتیش بەپێی پێویست ناکەن، خۆی لەئەسڵدا کە تۆ کارناکەیت دەبێت خۆت یەکلا کردبێتەوە بەوەی ئەم مانگە بۆ عیبادەت تەرخان دەکەیت ئەمە لەلایەك، لەلایەکی تر ئەم کارنەکردنە بەیەکجاری کاری کردۆتە سەر وەرەی ڕۆژووگر و موسڵمان، تەنانەت وای لێهاتووە کە ڕۆژوو گرتنی لێ بۆتە مۆتەکە! پێشەکییەکە درێژتر ناکەینەوەو فەرموون خوێنەری پارچەی دووەمی ڕۆژێکی پێغەمبەر ﷺ بن لە ڕەمەزاندا.

## قورئان

مانگی ڕەمەزان، یەکێك لەناوەکانی تری کەپێی دەناسرێتەوە مانگی قورئانە، یانی چی، واتە تەواوی قورئانی پیرۆز لەم مانگە و لەشەوی قەدردا دابەزیووە (خودا یاوەر بێت لە ڕەمەزاننامەکانی داهاتوو ئەم باسە بەیان دەکەین)، پەروەردگار دەفەرمووێت: (شهر رمضان الذي أنزل فيه القرآن هدى للناس وبينات من الهدى والفرقان). بۆیە لەم مانگەدا موسڵمانان بەگشتی ڕوودەکەنە قورئان خوێندن و هەریەکە بەلایەنی کەم خەتمێکی تەواوی قورئان دەکات. لە ڕەمەزاندا حەزرەتی جوبریل هەموو قورئانی بە پێغەمبەر ﷺ دەگووتەوە. ئەویش موسڵمانانی هان دەدا لەوەی لەم مانگەدا قورئان بخوێنن و وریای دەکردنەوە لەوەی بێئاگابن لەمە، پێغەمبەر ﷺ لە هەموو شەوێکدا جوزئێکی قورئانی خوێندووە، لەسەحیحی موسلیمدا هاتووە کە حەزرەتی جوبریل بە شەو قورئانی پێگوتۆتەوە، و هەندێکیش دەڵێن ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە قورئان خوێندن لەشەودا پاداشتی زیاترە! لە هەموو ڕەمەزاندا تەواوی قورئانی پێگوتۆتەوە تەنها لە دوا ڕەمەزان نەبێت دووجار ئەمەی کردووە. هەربۆیە موسڵمانانیش تابۆیان کراوە خوێندوویانە، ئەمە بەڕاددەیەك تا ئەوەی نەهی کراوە لەوەی بەسێ ڕۆژ کەمتر خەتمێك بکرێت، زۆرێك لە فەرموودەناسانی ئوممەت کە ژیانی خۆیان بۆ فەرموودە تەرخانکردبوو، لەم مانگەدا بەشێوەی کاتی

وازیـان لەدیراسـەی فـەرمووده هێنـاوەو ڕوویانکردۆتـە قورئـان، لـە ئیبن عەبدولحەکیمەوە گێڕدراوەتەوە کە ئیمامی مالك لە ڕەمەزاندا وازی لەدیراســەی فــەرمووده هێنــاوە و بەتــەواوی ڕووی کردۆتــە قورئان. لەسەر قورئان قسەی تر زۆرە و تەواوبوونی نییە، بەڵام با بۆ ئێرە هەر هێندە بێت، چونکە خودا یاوەر بێت هێشتا نزیکەی بیست ڕۆژی ڕەمەزانمان ماوە.

## ئیعتیکاف (مانەوە)

پێغەمبەر ﷺ لەمزگەوت ئیعتیکافی کردووەو ماوەتەوە، ئینجا ئەمــەش هــەر لــەدوای نــوێژی بەیانییــەوە دەســتی پێکــردووە، لەســەحیحی موســلیمدا هــاتووە: پێغەمبــەر ﷺ کــاتێ دەیویســت لەمزگەوتدا بمێنێتەوە نوێژی بەیانی دەکرد و ئینجا دەچوو بۆ ئەو شوێنەی کەتێیدا دەمایەوە...

هەر لەسەحیحی موسلیمدا هاتووە: پێغەمبەر ﷺ لە دە شەوی ســەرەتای ڕەمەزانــدا ئیعتیکــافی کــرد و، پاشــان لــە دە شــەوەی ناوەڕاستی ڕەمەزانیش کردی لە چادرێکی گومەزی تورکیدا، کە چەتری بەر دەرگاکەی حەسیرێك بوو، دواتر حەسیرەکەی بەدەستی پیــرۆزی لابــرد و خســتیە ســووچێکی چادرەکــەوە، و ئینجــا هاتــە دەرەوەو قسەی بۆ خەڵکی کرد... (درێژەی لە باسی شەوی قەدر بەیان دەکرێت پشتیوان بەخواد).

لـەدایکمان عائشــەوە هـاتووە، کـە پێغەمبـەر ﷺ لـە دە شـەوی کۆتـایی ڕەمـەزان دەمایـەوە هـەتا ئـەو کاتـەی گیـانی سـپارد و پاشانیش خێزانەکانی ئەم کارەیان دەکرد.

## جیهادیی لە ڕەمەزاندا

شــەڕ لەگـەڵ دوژمنـانی مرۆڤایـەتی لـەم مانگـەدا چەنـد جـار ڕوویداوە لەمێژووی ئیسلامدا، بەناوبانگەکەی بریتییە لە جەنگی بەدر، کە لە حەڤدەی ڕەمەزانی ساڵی دووەمی کۆچی بوو، خودا بە (یـوم الفرقـان) نـاوی بـردووە، کـە تیایـدا سـەرکەوتنێکی ئێجگـار گەورە وەدەست هاتوو، لەوێدا وانـە گەورەکانی مرۆڤایەتی فێری هەموو ئینسانیەت کران، ئینجا هەر لە مامەڵە لەگەڵ دیلەکان بگرە هەتا دەگاتە ڕێزگرتن و هەڵسوکەوت و نەخشەی ڕووبەڕوبوونەوە چەندانی تر. یەکێکی تر لـە جیهـادە بەناوبانگـەکان ڕزگـارکردنیی شاری مەککە بوو، کە ئەویش لەمانگی ڕەمەزانی ساڵی هەشتەمی کـۆچیی بـوو، لەوێشـدا بـۆ هـەتا مـرۆڤ لـە کۆیلـەی مـرۆڤ و بتەکان ئازادکرا.

## پێغەمبەر ﷺ چەند ڕەمەزان بەڕۆژووبووە؟

ڕۆژوو لـە مـانگی شـەعبانی سـاڵی دووەمـی کـۆچی فـەڕز بـوو، ئینجا بەگوێرەی وەفاتی ئازیزمان ﷺ بێت کە مانگی (ربیع الاول)ی

ساڵی ١١ی کۆچی بوو، ئەوا مانای وایە ٩ ڕەمەزانی بینیووەو بەڕۆژوو بووە .

## زەکاتی سەرفیترە

پێغەمبەر ﷺ لە ڕەمەزاندا ئەمری کردووە بە پێدانی زەکاتی سەرفیترە، ئەویش مەنێك (خورما وەیان جۆ، کەشك، مێوژ) بووە، (لەئێستادا بە پارە دەدرێت و لێژنەی فەتوا بڕی ٢٥٠٠ دیناری دیاری کردووە بۆ ئەمساڵ)، ئینجا ئەمەش لەسەر هەموو موسڵمانان واجب بووە و دەبێت بەر لە جەژن بدرێت، ئەوەی شایانی باسە پێغەمبەر ﷺ خۆی زەکاتی وەرنەگرتووە، ئینجا هەر شتێکی بۆ هاتبا سەرەتا دەیپرسی ئەگەر دیاری بووایە لێی دەخوارد و ئەگەریش خێر و زەکات بووایە نەیدەخوارد (ئەم پەرەگرافە کورتکراوەی چوار فەرموودەیە لە سەحیحی موسلیم دا لەباسی زەکاتی سەرفیترە).

## هەندێك ڕووداو بەکورتی لە ژیانی پێغەمبەر ﷺ لە ڕەمەزاندا

ئەم ڕووداوانەی لە مانگی ڕەمەزاندا ڕوویانداوە ناژمێردرێن، و یانیش بەلایەنی کەم دەبێت مەودایەکی زۆر فراوانی بۆ تەرخان بکەیت، بۆیە ئێمە لێرەدا تەنها ڕووداوە گرنگەکان ئاماژە پێدەدەین .

*ناردنی وەحی بۆ پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی دووشەمەی بیست و

یەکی ڕەمەزان بوو.

*کۆچی دوایی دایکمان و خۆشەویستە بەرزەکەی پێغەمبەر ﷺ، حەزرەتی خەدیجە، کە سێ ساڵ بەر لە کۆچ کردن بوو. ئەو ساڵە ناونرا ساڵی پەژارە، غەم وەیان حوزن.

*جەنگی بەدر لە ١٧ ڕەمەزانی ساڵی دووەمی کۆچی

*ڕوقیەی کچیی و خێزانی حەزرەتی عوسمان کۆچی دواییی کرد هەر لە ساڵی دووەمی کۆچی.

*حەزرەتی حەسەن لە ساڵی سێ یەمی کۆچی و لەمانگی ڕەمەزاندا لەدایك بوو.

*هەر لەمانگی ڕەمەزاندا و لە ساڵی سێ یەمی کۆچی پێغەمبەر ﷺ، (زەینەبی خزیمە)ی کردە هاوسەری.

*ڕزگارکردنی مەککەش هەر لەمانگی ڕەمەزاندا بوو.[١]

---

(١) سەرچاوەکان:
١. القران الكريم
٢. صحيح البخاری
٣. صحيح المسلم
٤. سيرة ابن هشام
٥. البداية والنهاية

# دوازدەیەم
# ڕەمەزانی منداڵان
# (لە پەروەردەدا پاداشت هەر کاڵا نییە!)

هەریەك لەئێمە لەنێو خێزانێکدایە، ئینجا یان ئەوەیە کە خۆی خێزاندارە، وەیان هێشتا لەچوارچێوەی ماڵە دایبابی دەژیەت. دیارە کەوتمان خێزان، ئیتر یەکسەر پەیوەندی، و پەیوەستی نێوان ئەندامان لەخەیاڵماندا چەکەرەی دەکات، لەنێوانیشیاندا منداڵ، کە کوردەواری دەڵێت: منالْ میوەی ماڵە، دەی ئینجا ڕاستە، ئەوەتانێ ساتێ ئەوان خەوتوون ماڵێکی چۆڵ و کاتێکیش ئەوان ئامادەن ئیدی هەر مەپرسن! مافی ئێمەی برا و باوك، خوشك و دایك، باپیر و داپیر، مام و خاڵ و ... بەسەریانەوە زۆر زۆرن، ئەوان بەزمانی حاڵ لەهەر کارو کردەوەیەکی ڕۆژانەیان داوای یارمەتی لەئێمە دەکەن و چاویان لەئامۆژگاریەکانی ئێمەیە. جا ئەوەی پەیوەندی بە باسەکەی ئێمەوەیە، ڕەمەزانی منداڵانە، دونیای ڕەمەزانی ئەوان لە دونیای ڕەمەزانی ئێمە هەر زۆر جیاوازە، لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانین هەموو ڕۆژێکی ڕەمەزانیان بۆ بکەین بە خۆشی و شادی. جارێ بەر لە هەموو شتێك کاتێك کە دەزانیت منداڵ لەماڵەکەدا هەیە، بەر لە ڕەمەزان هەمیشە باس و خواسی هاتنی ئەم مانگە باس بکە،

باسی ئەوە بکە کە بە هاتنی ئەم مانگە چەندە دڵخۆش دەبن و چۆن هەموو شتێك گۆڕانکاری بەسەر دادێت، کە دەزانیت منداڵەکەت لە مەجلیس دانیشتووە وشانێکی سادە بەکارببە و دەستەواژەی قورس و میتافۆڕ مەخەرە نێو قسەکانت، باسی دڵاوایی و دڵخۆشی هەمووان بکە، باسی ئەوە بکە کە یانزە مانگە ئەم دڵەی ئینسان خەراپ بووە، لەوە دەچێت ژەنگی گرتبێت، بەتەواوی ئیشی خۆی نەکات، ئەم مانگە مانگی چاککردنەوەی دڵەکانە، مانگی زیادبوونی چەند هەندەی ڕزق و ڕۆزی و بەرەکەتە...

داییاب بەزمانی سادە دەتوانێت باسی ئەوە بکات، کە ڕۆژوو چییە، چۆن و بۆچی خۆمان دەگرینەوە لەخواردن و خواردنەوە، چۆن دەتوانین بەدرێژایی ڕۆژەکە هیچ نەخۆین و ئینجا سوودیشی بۆمان هەبێت، چی مان دەست دەکەوێت، ئایا دەستکەوتەکان هەر لە دوارۆژن یان لە دونیاش...

داییاب دەتوانێت بەزمانی سادە باسی ئەوە بکات کە بۆچی بەم مانگە دەڵێن مانگی قورئان، شەوی قەدر یانی چی، نوێژی بەکۆمەڵ و تەراویح مانای چین...

### دەستپێك

جارێ بەر لە هەموو شتێك، بەر لە ڕەمەزان تۆ دەبێت کەش و هەوایەکی وا دروست بکەیت، کە هەر بەڕاستی منداڵ هەست

بەگۆڕانکاریی بکات و بەمجۆرەش بەتەواوی خۆت ئامادە بکەیت بۆ ڕەمەزان (لەزنجیرەی سفری ڕەمەزاننامە باسی ئامادەکاریمان کرد)، ئامادەکارییەکانت با هەر لەسەر ئاستی خواردن و خواردنەوە نەبێت، کە ئەسڵەن زۆریان لەجێتی خێرو بەرەکەت دەبن بە گوناه بەسەرمانەوەو ناخورێن و فڕێدەدرێن... هتد. ئامادەکاریەکانت با پاککردنەوەو ڕازاندنەوەی ماڵەکەش بێت و گرنگیی بە ورد و درشتی هەموو شتێك بدە کە پەیوەستە. باسی پاککردنەوە و چاککردنەوەی دڵەکان بکەن، باسی ئاشتەوایی و گەردن ئازادیی و لێبوردەیی بکە، و بیکە بە پیشە بەر لە ڕەمەزان گەردنی هەموو خەڵکی ئازاد بکە و شوێنپێی ئەم نەریتە چاکەش بۆ منداڵەکانت جێبهێڵە...

## ڕۆژووی منداڵان

بۆ منداڵان هەمیشە ڕۆژوو قورسە! چوون ئەوان هەموو دەم حەز بە خواردن و خواردنەوە دەکەن، بەتایبەت لەخوار حەوت ساڵی، بەڵام چەندین تەکنیك هەن کە تۆ ئەگەر منداڵی ئەم تەمەنانەت هەبوو دەتوانی یارمەتی بدەیت لەفێربوون و لێڕاهاتنی. لەسەحیحی ئیبن حەببان داهاتووە منداڵ تا دەگات بە ئیحتیلام هێشتا ڕۆژووی لەسەر واجب نییە، بەڵام کێشەکە ئەوەیە کە ئەگەر تۆ پاشخانێکی چاکت بۆ نەڕواندبێت لەپێشوو، ئەوا لەم تەمەنەشدا گرتنی ڕۆژوو زۆر زەحمەت دەبێت.

## ئێمە چۆن فێری ڕۆژووگرتن بووین

منداڵی ئێمە کە بەمنداڵی بێ نازو قەیران و قات و قڕیی و نەهامەتی دەناسرێتەوە، جیایە لەگەڵ ئێستای ژیان، ئەوکات هێشتا چەند مانگی مابوو بۆ ڕەمەزان ئێمە دەمانزانی، ئەویش بەهۆی ئەوەی کە هەمیشە باس دەکرا، سەبارەت بە ڕۆژووگرتنیش زۆر هاندەدراین، ئینجا کە پارشێومان دەکرد، و پاشان بەیانییەکەی ئاسایی بوو، هەتا کات دەگەیشت بەنیوەڕۆ، لەوێ لەسەر دڵمان قورس دەبوو، و بەرگەی برسێتی یان تینوێتیمان نەدەگرت و ئەوەبوو چێشتیان بۆ حازر دەکردین، پاشان ئێمەیش لەخۆشەویستی ئەم مانگە حەزمان نەدەکرد ڕۆژووەکە بشکێنین، بۆیە پێیان دەگوتین، کە ڕۆژوەکەتان بۆ گرێ دەدەینەوە! داویان دەهێنا و گرێ یان قوفڵیان لێدەدا بەمانای ئەوەی کە ئێمە ڕۆژووەکەمان شکاند، بەڵام بۆیان لکاندینەوە بە ئێوارە، ئینجا ئیتر دوای ئەوە دیسان هیچمان نەدەخوارد تاوەکو ئێوارە، و عادەتیش وابوو کە دەچووین بۆ مزگەوت و پاشان گوێبستی وتاری عەسران دەبووین و ئیتر تا ئەوکاتیش شتێکی ئەوتۆی نەدەما بۆ ئێوارە و چاوەڕێ بووین لەسەر تەلەفزیۆنەکە تۆپی بەربانگ لێبدات و وەیان لەبەردەرگا چاوەڕێمان دەکرد.

## ڕۆژوو لەئێستادا بۆ منداڵان

ئەم باسە دوو لایەنەیە، یەکەم بەوەی کە چەندین ئاسانکاری پەیدابووە بەهۆی نیعمەتی زانست و تەکنۆلۆژیا، ئەوا دەشێت ڕۆژوو بۆ منداڵان لەئێستادا ئاسانتر بکرێت و سوودی لیوەربگیرێت، لەهەمان کاتیشداو لەلایەکی تر، هەر ئەم تەکنۆلۆژیایە دەکرێت ببێت بە ڕێگر و بەربەست لەبەردەم پەروەردەکرنی دەروونی منداڵان، وەڵامەکەش زۆر سانایە، بەوەی دایباب کاردانەوەیان چۆنە بۆ تەکنۆلۆژیا ئیدی زۆربەی منداڵانیش ئاوان!

## لە پەروەردەدا پاداشت هەر کاڵا نییە

دەتوانی پاداشت وەك هاندانێك بەکاربهێنیت بۆ منداڵان لەبەرامبەر بە ڕۆژووبونیان، بەڵام تۆی دایباب وریابە نەکەویتە هەڵەی ئەوەی کە پاداشت هەر دەبێت کاڵا بێت، پاداشت هەر دەبێت پایسکل و بووك و ماڵە باجێنەو... چی و چی بێت، بەڵکو ئاگاداربە پاداشتەکانت دابەش بکە سەر چەندین جۆر، ئەسڵەن بیکە بەهەلێك تاوەکو پاداشتی دونیا و دوارۆژ لەیەك جیابکرێنەوە، و بەڵێنیان بدە کە سەفەرێکیان پێبکەیت لەم هاوینە بۆ یەکێك لە هاوینەهەوارەکانی کوردستان، پەیمانی پادشتێکیان پێبدە کە سوودی هەبێت و کتێبێکی منداڵانەیان بۆ بکڕە تایبەت بە

چیرۆکەکانی ڕەمەزان (پێم وایە نزیکەی ٣٠ جۆر بابەت وکتێبی کوردی هەیە لەم بارەیەوە بۆ منداڵان)، هەمیشە پرسیان پێبکە کاتێك بەڕۆژوون بۆ ئێوارە حەزیان لە چ جۆرە خواردن و شیرینیەکە... (ئامان و سەد ئامان ئاگات لە تەندروستیان بێت)...

### هاندانەکان

چەندین خاڵ هەن تۆی دایباب دەتوانیت بیکەیتە سەرچاوەی هاندانی منداڵان بۆ ڕۆژوو، لەوانە:

*هەمیشە بەگەورەیی باسکردنی ئەم مانگە و بەیانکردنی پاداشتە نەبڕاوەکانی.

*هەندێکجاریش دەتوانیت وەکو ئامادەکاری لەمانگی شەعباندا هانی بدەیت بەڕۆژوو بێت.

*هاندانیان لەبەردەم خزم و خۆیشان (ئاگاداربە ئەم هاندانە نەبێت سەرچاوەی چاندنی ڕیا!)

*ئەگەر تەمەنیان هێشتا لە حەوتساڵی بچووکترە، لەوانەیە باشتر وابێت کە پارشێویان بۆ تاخیرتر بکەیت وەیان لەبەرەبەیاندا...

*بەسەربردنی ڕۆژووەکە بەشتانێك کە نەهێندە هیلاکیان بکات و نە ئەوەندەش بێزارکەر بێت، بەنموونە دەتوانیت لەگەڵ خۆتدا

بیبیەت بۆ مزگەت بۆ نوێژەکان و بۆ وتاری عەسران... دەتوانیت لەماڵەوە لەچەندین چالاکی بەشداری پێبکەیت...

*هانی بدە بە پاداشت (لەسەرەوە باسکرا) .

((تۆش دەتوانیت خاڵی تری بخەیتە سەر...))

## کۆمەڵێ بیرۆکە

بیرۆکەی زۆر هەن بۆ دروستکردنی کەش و هەوایەکی ڕەمەزانیی لەنێو ماڵدا، لەوانە:

١. دروستکردنی مزگەوتی چکۆڵە لەماڵەوە بە کارتۆن و کەل و پەلی تر و ڕووناك کردنەوەیان، ئینجا خۆ ئەگەر منداڵەکە ژووری تایبەت بەخۆی هەیە ئەوا کۆمەڵێ شتی زۆر هەن دەتوانیت بیکەیت (ئەمانە دەکرێ بێ هیچ تێچوویەك جێبەجێ بکرێن!).

٢. نامە ڕەمەزانییەکان، دەکرێت دەرگای سەلاجەکە وەیان هەر شوێنێکی تر بکەیتە تەختەی ڕاگەیاندن، و هەموو ڕۆژ ئاگاداری و ئامۆژگاری و داواکاری و زانیاری و چەندان شتی تری لێبنووسیت و بیکەیت بە نەریتێکی ڕەمەزانانە...

٣. فانۆسی ڕەمەزان و ڕووناککەرەوەکان و شتی تر بکە لەهەلێك بۆ بەشداری پێکردنیان و دلخۆشکردنیان...

٤. بەژداری پێکردنیان لە ئامادەکردنی چێشت و شت کڕین و شتی تر...

٥. سەیرکردنی چەندین کارتۆنی ئایینی لەوانە چیرۆکی پێغەمبەران و یان چیرۆکی ئازیزمان ﷺ و چەندانی تریش کەئێستا زۆر بەسانایی بەردەستن .

٦. زوو زوو باسی جەژن و خۆشییەکانی جەژنییان بۆ بکە ...

((دەتوانیت خاڵی تری بخەیتە سەر)).

## کۆبوونەوەی خێزان

یەکێکی تر لەخاسییەتەکانی مانگی ڕەمەزان کۆبوونەوەی ئەندامانی خێزانە، تەنانەت لەم سەردەمەش کە تەکنۆلۆژیا ساڵانێکە ئەندامانی خێزانی لەناو ماڵێکدا کەرەنتینە کردووە و بەدەگمەن نەبێت هەرگیز بەیەکەوە نان ناخۆن و وەیان کۆنابنەوە! بەڵام لە ڕەمەزاندا هەمیشە ئەمە جیاوازە، ئەمەش بەرەکەتێکەو لەدەستی مەدە، لەوێدا تۆ دەتوانی وەکو هەلێك ئادابەکانی ڕۆژوو، ئادابەکانی ژیان و قوتابخانەو و خوێندن و چەندان شتی تری بەسوود باس بکەیت...

## منداڵان چۆن دەڕواننە ڕەمەزان

ڕوانگەی منداڵان بۆ ڕەمەزان جیاوازە، تەنانەت لە لەهەمان ماڵ

لەمنداڵێکەوە بۆ منداڵێکی تر دەگۆڕێت و هەر کەس خاوەن گۆشەنیگای خۆیەتی، لەوەش زیاتر کوڕێك و کوڕێك جیاواز دەڕواننە ڕەمەزان، کچێك و کچێك بەجۆری جیا ڕەمەزان خەیاڵ دەکەن. هەندێکیان دەچنە ژێر باری ئەوەی کە ڕەمەزان ماندووبوونەوە و هەندێکیان بەهۆی هەڵە باوەکەی ئێمەی دایباب بە مانگی خواردن و خواردنەوەی دەزانن، و کۆمەڵێکە تر هەڵەی دایباب دەقۆزنەوە بۆ ئەوەی ببن بە شاگردێکی چاکی زنجیرە درامای بێسوود! کەوابوو ڕوانگەی منداڵ لە ڕوانگەی دایبابەوەیە بەزۆر، و هەتا تۆی دایباب زیاتر و زیاتر گرنگی بەم مانگە بدەیت ئەوانیش زیاتر لەمە نزیك دەبنەوە...

**شەوانی قەدر**

بەگشتی منداڵ حەز بەخەوتن ناکات و هەمیشە حەزدەکات کاتی زیاتر بەخەبەر بێت و بەتایبەت لەم تەمەنەی چونکە هەردەم شتی نوێ دەدۆزتەوەو فێردەبێت، بۆیە دەکرێت شەوانی قەدر بکرێن بەهەلێك تاوەکو منداڵان تا چەندە ڕێی تێدەچێت لەگەڵ خێزاندا بمێننەوە...

**قورئان**

ئەگەر منداڵەکەت لە ڕەمەزاندا فێری قورئان نەکەیت ئەوان بێگومان تۆ هەلێکی زۆر گەورەت لەدەستداوە، و

قەرەبووکردنەوەشی ڕەنگە تۆزێك زەحمەت بێت. ئەوەی جێگەی خۆشحاڵییە تاوەکو ئێستاشی لەگەڵدا بێت زۆربەی مزگەوتەکان لە ڕەمەزانانـدا جمەیانـدا دێت لە منـدالآن، کـە لەوێـدا فـەقێ و مامۆستا و پەروەردەکارانی خۆبەخش ماندوو نەناسانە لەگەڵیان هەوڵ دەدەن.

# سێزدەیەم
# ڕەمەزان لە گۆشەنیگای «شێخ شەعراوی»دا

**پێشدەستی**

لـە دەسـتپێکدا، گـەنجی کـورد کـەم تـا زۆر شـێخ شـەعراوی (١٩١١.١٩٩٨) دەناسـێت و پێـی ئاشـنایە، جگـە لـەوەی ژمـارەیکی باشـی لـە خـەڵکیش خوێنـەری کتێـب و تەفسـیرەکانی ئـەون. مـن نامــەوێ بچمــە ســەر ژیــانی تایبــەت و ڕێگــەی وەدەســتهێنانی زانسـتیی، بـەوەی کـە لای هـەمووان ئاشـکرایە و، ئـەو ئەگـەرچی پسـپۆری خـۆی زمـان بـووە، بـەڵام دەسـتێکی بـاڵای لەتەفسـیری قورئــانی پیــرۆز هــەبووەو بەیــەکێك لەموفەســیرە نوێیــەکان دەژمێردرێـت، کۆمـەڵێك پۆسـت و پایـەی پـێ سـپاردراوە لـەماوەی ژیانیـدا، لەوانـە بەڕێوەبـەری ئـەوقافی پارێزگایـەك و بریکـاری ئەزهـەر و دواجـاریش وەکـو وەزیـری ئـەوقاف لەمیسـڕ دەسـت بەکاربووە. ئەو جگە لە تەفسیرە بەناوبانگەکەی چەندان بەرهەمی تـری نـاوازەی هەیـە لـەبوارەکانی عەقیـدە و فیکـر و فیقـە و شـیعر. ئینجــا ئــەوەی لێــرە مەبەســتمانە و دەمانــەوێت ئــەم ئێــوارەی ڕەمەزاننامـەی پـێ شـیرین بکـەین، ئـەویش وشـەی ڕەمەزانـە لـەلای

جەنابیان، فەرموون خوێنەری ئەم کورتە بابەتە وەرگێڕدراوە بىن کە لە یەکێك لە ڤیدیۆکانیدا وەرمانگرتووە:

## پێشوازیی مانگی ڕەمەزان

من حەز ناکەم پێشوازیم لەم مانگە پێشوازییەکی کۆن و باو بێت ساڵ دوای ساڵ، هەروەها حەزیش ناکەم کە ئەمساڵ لە ساڵی پێشووتر خێری کەمتر بێت، کەوابوو؛ پێشوازی و ئامادەکاری بۆ ڕەمەزان گەر بەڕووکار بێت ئەوا نە ڕەمەزان حەزی لێیەتی و نە ئەومانایەش دەدات. ئەگەر بێت و دڵمان بەڕەمەزان خۆش بێت ئەوا دەبێت حەز بەوەش بکەین کە ڕەمەزانیش دڵی بەئێمەوە خۆش بێت. هەروەها ئەویش دڵی بە ئێمە خۆش نابێت مەگەر بەمجۆرە نەبێت کە خودا دەیەوێت و دەبێت لەگەڵیدا بژین، و نەوەك بۆ خودی ڕەمەزان. بەڵام بۆئەوەی ڕەمەزان ڕەنگبداتەوە لەسەر هەموو کارو کردەوەکانمان و مانگەکانی دواتر، بەمجۆرەش لەترسناکترینی ترسناکییەکان ئەوەیە کە تەنها بۆ خاتری کاتەکە بژین، چونکە ڕەمەزان وەك زنجیرەیەکی لێکنەپچراوی ئایین وایە کە خەڵکی تێیدا دەگوزەرێنن، و بۆ هەموو خەڵکی و لە هەموو کاتێکیشدا.

## گەورەیی ڕەمەزان

وە ئەگەر ویستمان فەزڵی ئەم مانگە بزانین، ئەوە من چاکترم پێنیە لە قسەی خودا کە دەفەرموێت: (شهر رمضان الذي أنزل فيه القرآن هدى للناس وبينات من الهدى والفرقان). واتە: مانگی ڕەمەزان (ئەو مانگەیە) کە قورئانی تیادا هاتۆتە خوارەوە، لەکاتێکدا ئەم قورئانە ڕێنموونی بەخشە بەخەڵکی و بەڵگەی تیادایە، لە ڕێنمونی و جیاکردنەوەی ڕاست و ڕەوان، حەق و ناحەق. (البقرة:١٨٥). وە ئەگەر خودای لایەق بە ستایش و پیاهەڵدان نموونەی بۆ هێناوینەوەتەوە لە قورئاندا بەوەی کە دەفەرموێت: (لو أنزلنا هذا القرآن على جبل لرأيته خاشعا متصدعا من خشية الله). واتە: ئەگەر ئەم قورئانەمان داببەزاندایە سەر کەژو کێوێك، دەتبینی ملکەچ دەبوو، وردو خاش دەبوو، شەق و پەق دەبوو، لە ترسی فەرمانی خوا، لەهەیبەتی گەورەیی و دەسەڵاتی خوا. (الحشر:٢١).

هەروەها (خاشع) بەمانای ملکەچی و گوێڕایەڵی بێ سنوور، هەروەها (المتصدع) واتە هەموو گیانی شڵەژاو، شپرزە بوو، کەواتە دابەزینی قورئان لەم مانگەدا، شایەنی ئەوەیە کە بەم جۆرە پێشوازی لێبکرێت، وە خودای گەورە داوادەکات ڕێز لەم مانگە بگرین بە ڕۆژووگرتن، جا ڕۆژووگرتنیش واتە خۆگرتنەوە لە حەز

و ئارەزووی سك و دامێن لە ڕۆژدا، ئارەزووش شتێکە لەسەرووی پێویستیەوەیە، شتێکیش لەسەرووی پێویستیەوە بێت واتە هەم حەزەو هەم ئارەزووشە. جا ئەگەر خودای خاوەن ستایش قورئانی لەم مانگەدا دابەزاندووە، وە قورئانیش هەڵگری پەیامی خودایە و موعجیزەی باوەڕکردنە بە پێغەمبەر ﷺ ئەوە مانای وایە کە ئەم مانگە ڕووداوێکی زۆر گەورەیە بۆ ڕێرەوی مرۆڤ، بۆ ڕێکردنی ژیانێکی ڕەوان و پڕ بەهاو پەیامدار و سەر ڕاست بە پەیامی ئافرێنەر (خالق)، ئینجا ئەمەی کە زۆر سەرنجی مرۆڤ ڕادەکێشێت ئەوەیە کە خۆبگرێتەوە لەدوو شت، خۆپاراستنی خود لە خواردن و خواردنەوە، هەروەها خۆپاراستن لەو کردەیەی کە ناسراوە لەنێوان ژن و مێردا .

### لەبارەی پێشوزایی نادروست

لە ڤیدیۆیەکی تردا شێخ شەعراوی دیسانەوە باسی پێشوازی موسڵمانان دەکات بۆ مانگی ڕەمەزان، پوختەکە بەمجۆرەیە: موسڵمانان زۆر بەگەرمی پێشوازی لەم مانگە دەکەن، بەڵام بەداخەوە جۆری پێشوازییەکە ئەوەنییە خودا دەیەوێت، کە ئەویش ئامادەکارییە بە کڕینی خۆراك و کەل و پەلی زۆر، و یان وەك ئەوەی ئێمە لەم یازدە مانگەی پێشوو سەیری هیچ شتێك و هیچ گاڵتەو شتێکمان نەکردبێت و هەر تەنها لەم مانگە دا نەبێت، کە لەئەسڵیشدا دەبوو لەم مانگە لەخەوی بێئاگایی داوای لێبوردەیی بکەین.

**لەبارەی ڕۆژوو**

لەشـــوێنیکی تـــردا و لـــەبارەی ڕۆژوو دەڵێـــت: ڕۆژووو پەرستشـێکی کۆنـە کـە خـودای گـەورە فـەڕزی کـردووە لەسـەر میللەتانی پێشـوو، تەنانـەت ئەگـەر جۆر و چۆنیـەتی ڕۆژووەکەش جیـاواز بێـت لـە ڕۆژووی ئوممـەتی پێغەمـەر ﷺ، ئـەوەتانێ خـودا دەفەرمووێت: (یا أیها الذین آمنوا کتب علیکم الصیام کما کتب علی الذین من قبلکم لعلکم تتقون أیاما معدودات فمن کان منکم مریضا أو علی سفر فعدة من أیام اخر وعلی الذین یطیقونه فدیة طعام مسکین فمن تطوع خیرا فهو خیر له وأن تصوموا خیر لکم إن کنتم تعلمون). واتـە: ئـەی ئـەو کەسـانە کـە باوەڕتـان هێنـاوە ڕۆژووی ڕەمەزان لەسەرتان پێویست کراوە هەر وەکو لەسەر گەلانی پێش ئێوە پێویست کرابوو، بۆئەوەی خوا ناسی و پارێزکاری بکەن. چەند ڕۆژێکی ژمێردراوی دیاریکراو (کە مانگی ڕەمەزانە) خۆ ئەگەر کەسێك لە ئێوە نەخۆش بوو، یان لەسەفەردا بوو با بە ئەندازەی ئـەو ڕۆژانـەی بـۆ نـەگیراوە لـە ڕۆژانێکـی تـردا بیانگێڕێتـەوە و ئەوانـەش کـە بەزەحمـەت دەتـوانن بـەڕۆژوو بـن (وەکـو پیرەمێـرد و نەخۆشـە بەردەوامـەکان) ئـەوە بـا ژەمێـك خـواردن ببەخشـین بـە هەژارێك، ئەوەی زیاتر ببەخشێت ئەو باشترە بۆی، بێگومان ئەگەر بـەڕۆژوو بـن چـاکترەو پاداشـتی زۆرتـرە ئەگـەر بـزانن و (بتـوانن). (البقرة: ١٨٣.١٨٤).

## ڕۆژانێکی دیاریکراو

خـودای خـاوەن سـتایش، پەرستشـی ڕۆژووی بـە ڕۆژانێکـی دیاریکراو دەستپێکردووە، وەکو ڕۆژی عاشورا، وەیان هەموو سێ ڕۆژ لەمانگێکدا... هتد، وە ئـەم ڕۆژە دیاریکراوانـە ڕێگـە دراوە بـۆ مرۆڤ کە تیایدا بەڕۆژوو بێت جگە لە نەخۆش و موسافیر، ئەوان دەبیت لە ڕۆژانی تردا ئەم ڕۆژووە بگرنەوە.

بـەڵام کاتێـك خـودای گـەورە ڕۆژووی واجـب کـرد لـەمانگی ڕەمەزان ئەوا ئەم هەڵبژاردەیەی دانەنا، ئەمەش بە بەڵگەی ئەوەی وشـەی "یطیقونـە" لـەم ئایـەت دا نـەهاتووە کـە خـودا دەفـەرمووێت: (شهر رمضان الذي انزل فيه القرآن هدى للناس وبينات من الهدى والفرقان فمن شهد منكم الشهر فليصمه ومن كان مريضا أو على سفر فعدة من أيام اخر). وەکو ئەوە وایە کە ڕۆژوو لە ئیسلامدا لـەدوو قۆناغـدا واجبکـراوە، یەکـەمیان خـودای گـەورە ڕۆژووی واجبکردووە لە ڕۆژانێکی دیاریکراو بۆ ئەوانەی کە نەخۆش نین. ئەوەش کە ناتوانێت دوو هەڵبژاردەی لەبەردەستە، یان ئەوەیە کە بـەڕۆژوو بێـت و ڕۆژووش خێرتـر و چـاکترە، وەیـان فیدیـە بـدات. دووەمـیش کاتێـك خـودا ڕۆژووی واجـب کـرد لـە ڕۆژانێکـی دیاریکراو لە ڕەمەزاندا ئەوا ئەم ڕووخسەتەی تێدانەبوو، چونکە وشەی "یطیقونە" لە ئایەتەکەدا نییە، بۆیەو ئەوانەی کە دەتوانن یا نـا، بۆیـان نییـە کەفیدیـە بـدەن تـەنها ئەوانـە نـەبێت کـە خـودا دیاریکردوون، ئەوانیش نەخۆش و موسافیرن.

# چواردەیەم
# ڕیکلام لە ڕەمەزاندا!

ڕیکلام لە ڕەمەزاندا، شەپۆلێکی توندی ساغکردنەوەی هەموو جۆرە کاڵا و کەل و پەلێك و خواردەمەنییەکە! بەداخەوە؛ چاوت لەسەر هەر کەناڵێکی تەلەفزیۆنی، یان بەرنامەیەکی ڕادیۆ، وەیان تەنانەت تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان... بێت، دەبینی ژمارەیەکی زۆر لەرێکلامی بێ سەروبەر نیشان دەدرێن بەبێ هەبوونی هیچ باکگراوەندو زانیارییەك لەسەر ئەم بەرهەمانە! لات سەیر نەبێت کەناڵ هەیە تەنها لە یەك خولەکدا ڕیکلام بۆ سێ جۆر برنج دەکات، هەریەکەوە ٢٠ چرکەی بۆ تەرخان کردوون! تەنانەت بینەر نازانێت بچێت بەلای کامیاندا...

**ڕوانگەی ئێمە**

من و زۆرێك لەئێوە ڕەنگە پسپۆریەکەیان تەندروستی و خۆراك نەبێت، بەڵام ئایا ئەوە ڕێگرە و بەربەستە لەبەردەمی ئەوەی کە تۆ لەپێناو تەندروستی خۆت و خێزانەکەت لەسەر ئەم بابەت بخوێنیتەوە، وەیان بەلایەنی کەم تێبفکریت!

## ڕوانگەی بازرگان

کۆمــــەڵێك بازرگـــان، ڕەمـــەزان وەك هـــەلی ســـاغکردنەوەی کاڵاکانیـــان ســـەیر دەکـــەن و پێشـــوەختە ڕیکلامـــی تایبـــەت بـــۆ کاڵاکانیـان دەکـەن و تیایدا وێنەگـەلێکی وەك کۆبوونـەوەی خێـزان لەســـەر یـــەك خـــوان، فانۆســـی ڕەمـــەزان و نەریتـــە ئیســـلامیی و کۆمەڵایەتییـــەکان دەکەنـــە باکگراونـــدی ڕیکلامـــەکانیان تـــاوەکو چێژێکی ڕەمەزانیی بدەن پێی .

## سك بەرلە هەموو شتێك

نزیکەی سەدا سەدی ڕێکلامەکانی ئێستا هیچ جۆرە سوودێکی تێدا نییە و ئامانج لێی ئەوەیە کە هاوڵاتی بەر لە هەموو شتێك خەمی پڕبـوونی سـکی بێـت و بـۆ ئـەوانیش بـەر لـە هـەموو شـتێك خەمی قڕبوونی گیرفان بێت.

## تۆ پارە دەخەیتە گیرفانیان و ئەوانیش ژەهر دەخەنە نێو گەدەت

تۆی بەرپرسیار، دەبێت بەر لە هەموو شتێك بیر لەوە بکەیتەوە کـە ڕەمـەزان مـانگی خـواردن و خواردنـەوە نییـە، بـەڵکو ڕێـك

پێچەوانەکەی، واتە هەریەك لەئێمە یازدە مانگ خەریکی خواردن و خوادرنــەوەین، و تــەنها ئــەو مانگــە دەبێــت خۆمــان بگرینــەوە و پارێزکـاری بکـەین، نـەوەك یـازدە مانـگ بخـۆین و بخۆینـەوەو ئـەو مانگەش زیاتری بکەین. ئینجا تۆی بەرپرسیار تا ئێستا بیرت لەوە کردۆتـەوە کـە تـۆ خەریکـە پـارە دەخەیتـە نێـو گیرفـانی کۆمـەڵێك بازرگانی بێ ویژدان و چڵێس، ئەوانیش ژەهر دەخەنە نێو گەدەت!

## خواردنەوە

لــە ڕەمەزانــدا خواردنــەوەکان بازاڕیــان گەرمــە! یــەکێك لــەو خواردنەوانـەش شـەربەتە! ئینجـا هـەر مەپرسـن و ویژدانـاتن بخەنـە پێش گەدەتان. دەی هێشتا ئەمە هەر باشترە لەوەی تر، مەبەست لە خواردنەوە گازییەکان! بزانە چ حیکمەتیك لەوە دایە کە تۆ ١٢ بۆ ١٤ کــاتژمێر هــیچ نــەخۆیت و دواتــر بــە خواردنەوەیــەکی گــازی بەربانگ بکەیتەوە.

# پازدەیەم
# کتێبی برسێتی (برسیەتی)!

لـه هـەموو ڕەمەزانێكـدا، كتێبـی "برسـێتی" یەكێكـە لـە كتێبـە هەڵبژێردراوەكان لـەنێو هەموو ئـەو لیسـتانەدا هەیـە كـە پێشـنیازی كتێبگـەلێك دەكـەن بـۆ خوێندنـەوە لـەم مانگـەدا. ئـەم كتێبـە لـە نووسینی (أبی بكر عبدالله بن محمد ابن أبی الدنیا)یە، ئەو لەنێوان سـاڵانی ٢٠٨ بـۆ ٢٨١ی قەمـەڕی ژیـاوەو لـەدایكبووی شـاری بەغدادە. لەبارەیەوە زۆر شت وتـراوە، بەنموونـە تـوێژەری ئوممەت ئیـبن حەجـەر بـە "ڕاسـتگۆ" نـاوی بـردووە، هـەروەها ئیـبن ئـەبی حاتەمیش بەهەمان شێوە. جگە لەوەش وتراوە، كەسێك بووە، گەر نیازی وابووایە كەسێك بگریەنێت، دەیگریاند و ویستبای كەسێك بهێنێتە پێكەنین، ئیتر دەیكرد.

**برسێتی**

لەمێژە وتراوە ئەوەی مرۆڤی بەهیلاك برد، پڕبوون و تێری بوو! تێربـوون جۆرێـك لـەئارەزووە، ئـارەزووش وەكـو لەكۆنـەوە وتـراوە

باوكـە ئـادەمی لەبەهەشـت وەدەرنـا. ئینجـا تێربـوون هـەر بەتـەنها تێربـوونی سـك نییـە، چونكـە كاتێـك سـك پڕدەبێـت، ئیـدی مـرۆڤ لێرەوە ئارەزووی تری سەر دەردەكات... بەهەمان شێوە برسی بوون تـا ڕاددەی مـردن، ئەمیشـیان هـەر دەردێكـە بۆخـۆی، و چەنـدان نەخۆشی لێدەكەوێتەوەو هەروەك تێربوونیش سەرچاوەی سەرەكی نەخۆشـییەكانە. لەباسـی سـوودەكانی برسـێتی وتـراوە، كـە دڵ دەكاتـەوە، و چـاو ڕوونـتر دەكـات، زمانـت تـەڕدەكات بـە زیكـر، ملكەچی و گوێڕایەڵیت بۆ خودا زێتر دەبێت، دەردو بەڵات هەمیشە لەیادە، ئارەزووەكانت وەلا دەنێیت و بەسەریدا زاڵ دەبیت، خەوت هێنـدە زۆر نابێـت و بێداریشـت لەباشـیدا دەبێـت، پەرستشـەكان چاكتر ئەنجام دەدەیت... هتد.

### كام برسێتی؟

مەبەست لەباسی برسێتی ئەوە نییە كە تۆ بەوڕاددەیە برسیت بێـت كـە هیچـت بـۆ نـەكرێت و تووشـی بـەدخۆراكی و لاوازی و نەخۆشـییەكانی تـری جەسـتە بیـت، ئـەی كـەوابوو ئەمـە چ جـۆرە برسـێتیەكە؟ برسـێتی ئەوەیـە كـە پێغەمبـەر ﷺ خۆی لـە ئـارەزووی خواردن و خواردنـەوە پاراسـتووە، چوون خۆ ئەگـەر ئـەو مەبەسـتی بووایە هەموو شتێك بۆ ئەو دەبوو، بەڵام ئەو هەرچییەك هەبووبێت قەناعـەتی پێـی هـەبووە، ئـەهلی دونیـا هـەر گاهـ كـە زۆر دەخـۆن و تێـردەبن ئیـدی دەچنـە ژێـر بـاری سـوڵتانی خـەو. لەگـەڵ ئەوەشـدا

هەندێك لە زانایانی ئوممەت نەچوونەتە ژێر باری ئەم مەنتیقە، ئەمەش نەك لەبەرئەوەی کە قەبوڵیان نەبووە، بەڵکو هۆکاری تر هەبووە، بەنموونە: ئیمامی ئیبن جەوزی دەڵێت کە ئەو ناتوانێت بچێتە ژێر بارێکی لەمجۆرە وەك ئەوانەی کە خەڵکێك دەیکەن، واتە کەمکردنەوەی خۆراك بەڕاددەیەکی زۆر، چوون ئەو هەر لەسەرەتاوە ڕانەهاتووە، و ئێستاش گەر وابکات ئەوا سیستەمی خۆراکی تێکدەچێت و تەرکیز و بیری لێڵ دەبێت...

ئیمامی غەزالی دەڵێت: کە مەبەست لەبرسێتی ئەوەیە بێتاقەتت نەکات لە واجباتەکانت .

ئینجا گوتراوە کە دوای وەفاتی ئازیزمان ﷺ یەکەم بیدعە کە ئەهلی مەدینە تێیکەوتن، بیدعەی تێربوون بوو!

**کتێبی برسێتی**

وەکو ئاماژەمان پێدا ئەم کتێبە لەنووسینی زانای پایەبەرز ئیبن ئەبی دونیایە، ئەم کتێبە بە مەوسوعەیەکی ناوازە هەژمار دەکرێت، هەم لەمەسەلەی زوهد و هەمیش لە کۆمەڵێك بابەتی تردا، ئەم چاپەی کە لەبەردەستە بەشێوەیەکی جوان وردبینی بۆ کراوەو بابەتەکانی پۆلێن کراوە و ڕێکخراوە، چاپی دووەمی لەلایەن (دار ابن حزم) لە ساڵی ٢٠٠٠ لە دووتوێی ٢٦٦ لاپەڕەدا چاپکراوە، و محمد خیر رمضان یوسف وردبینی بۆکردووەو پەراوێزی بۆ

نووسیوە. لە هەموو مانگێکی ڕەمەزاندا گرنگی ئەم کتێبە دێتەوە بەرباس لای خوێنەران. مەبەستیش تیایدا ئەم مانگە لەگەڵ برسێتی دا هاوتان. ئێمە بڕیارمان دا گوڵچنینێك بكەین لەم گوڵزارە. لەهەر باسێکدا تەنها یەك نموونەمان هەڵبژاردووە، ئەویش بەهۆی ئەوەی کە کتێبەکە تژییە لەنموونەی زۆر و هەروەها بەقەبارەش گەورەیە. فەرموون خوێنەری ئەم نموونانە بن:

١. فەرمووده‌کان: (زۆرترینی ئەوانە کە تێرن لەدونیادا، زیاترینی برسین لە دواڕۆژدا، ئەی سەلمان، بزانە کە دونیا زیندانی ئیماندارەو بەهەشتی کافرە).

٢. پێغەمبەر: (پێغەمبەر ﷺ سێ ڕۆژ لەسەریەك تێر سکی خۆی نانی گەنمی نەخواردووە هەتا ئەوکاتەی گەشتە کاروانی خۆی. واتە تا ئەکاتەی وەفاتی کرد).

٣. دایکمان عائشە: (یەکەم دەرد و بەڵا کە لای ئەم ئوممەتە ڕوویدا دوای وەفاتی ئازیزمان ﷺ تێربوون بوو...).

٤. ئەبو جەعفەر: (ئەگەر سك پڕبوو، جەستە ستەم دەکات).

٥. ئیمامی عەلی: (ئەگەر دەتەوێت بگەیت بە پێغەمبەر ﷺ ئەوا هیوا کورت بە و نان بخۆ بەڵام بە تێری نا...) ئەم گوتەیەی بە ئیمامی عومەر وتووە.

٦. قیس بن رافع: (واوەیلا بۆ کەسێك کە دینی بریتییە لەدونیا، و هەموو خەمیشی هەر سکییەتی).

٧. ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم: (کاتێکی "خبیض"جۆرە حەلوایەکە، یان هەر خورما و ڕۆن تێکەڵ دەکرێت"یان بۆ ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم هێنا، لێی نەخواردو وتی ئەمە خواردنی منداڵانە و نایخۆم!)

٨. مالیکی کوڕی دینار: (چل بەیانی لەسەر یەك "الثجیر=هەر شتێ کە بهاڕدرێت یان بگوشرێت"م خوارد، ئەگەر لەوە نەترسابام کە گەدەم دادەخات ئەوا لەسەری بەردەوام دەبووم).

٩. محمد بن واسع: (هەرکەسێ کەمی خوارد، ئەوا تێدەگات و خەڵکیش تێدەگەیەنێت...).

١٠. عەبدوڵڵای کوری عومەر: (ئەو زۆرجار بانگی گەڕەکانیی دەکرد و لەگەڵ ئەواندا نانی دەخوارد، و دەیگوت بەڵکو لە ڕۆژی قیامەتدا هەندێك لەوانە لەخواپێداوان بن).

١١. أبو عبیدة الخواص: (نەگریسترینی خەڵکی ئەوانەن کە ئاگر دەدەن بە ئەوانی تر، بزانە کە سکت وەکو سەگ وایە، دەتوانی هەر تەنها بە لوقمەیەك دووری خەیتەوە).

١٢. حەسەنی بەسری: (سوێند بەخوا خەڵکانێکمان بینیوە و لەگەڵیاندا بووینە، کە هەرگیز لەماڵەوەدا خواردنیان بۆ دروست نەکراوە، و هەرگیزیش هیچ یەکێ لەوانە بەدڵی خۆیان تێریان نەخواردووە تاوەکو مردن...).

١٣. سمرة بن جندب: (بە سمرة بن جندب یان وت، کە دوێنی کوڕەکەت زۆر زۆری خوارد، ئەویش وەڵامی دایەوە، کە ئەگەر مردبوایە ئەوا نوێژم لەسەر نەدەکرد).

١٤. عمرو بن قیس: (وریابن و ئاگاداری سک تان بن، چوون زۆرخواردن دڵ ڕەق دەکات).

١٥. السری بن ینعم: (هەر بەندەیەك برسی بێت، ئەوا بێگومان خودا حیکمەت و پاکیی پێدەبەخشێت).

١٦. یوسف بن أسباط: (برسێتی سەری هەموو چاکە و خێرێکە لەدونیادا).

١٧. الأعمش: (ئەعمەش بە پیاوێکی وت: ئەی گەمژە، ئەم سکە دەبینی، ئەگەر ئیهانەت کرد. مەبەستی ئەوەیە کە برسیت کرد ئەوا ڕێزت لێدەنێت، بەڵام ئەگەر ڕێزت لێنا. مەبەستی ئەوەیە کە تێرت کرد. ئەوا ئیهانەت دەکات).

١٨. الحسین بن عبدالرحمن: (حیکمەت، لە سکی پڕ ڕاناوەستێت و نامێنێتەوە).

١٩. عبدالعزیز بن أبی رواد: (کەم خواردن، یارمەتی بەخشینی زیاتر دەدات)

٢٠. الصوری: (هەر کەسێك زۆر بخوات تارادەی تێربوون ئەوا بێگوان بەشێك لە عەقڵی لەدەست دەدات و هەرگیزیش بۆی نایەتەوە).

٢١. أبو عمران الجوني: (هەر کەسێك دەیەوێت دڵی پڕ نووربێت، ئەوا با کەم بخوات).

٢٢. سفيان الثوري: (بۆ سوفیانی سەوری نووسرابوو کە: گەر دەتەوێت جەستەت تەندروست بێت، ئەوا کەم بخۆ).

٢٣. حەکیمێکی هیندی: (زۆر خواردن جەستە بێ هێز دەکات). (ڕەنگە تۆش لات وابێت کە سوود بە جەستەت دەگەیەنی کاتێك زۆر دەخۆیت!)

٢٤. دایکمان عائشە: (پیاوێك هات و "جوارشن"ی بەدیاری بۆ هێنابوو، ئەویش لێی پرسی ئەمە چییە؟ پیاوەکە وتی ئەمە شتێکە لە عێراق دروست دەکرێت بۆ ئەوەی خواردن هەرس بکات، دایکمان فەرمووی: سوێند بەخوا لەدوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ هوە تێرم نەخواردووە).

٢٥. حکیم بن حزام: (جارێکیان حکیم بن حزام بە کەس و کاری وت، ئاوم بۆ بێنن، ئەوانیش پێیان وت کە ئەمڕۆ جارێك ئاوت خواردۆتەوە، ئەویش فەرمووی: کەوابوو ناخۆمەوە بۆم مەهێنن).

٢٦. صفون بن سليم: (زەمانێك دێت بەسەر خەڵکیدا کە هەموو خەمیان دەبێتە سك پڕکردن و دینیشیان دەبێتە ئارەزوو).

٢٧. پێغەمبەر عیسا ؑ: (پیاوێك بە عیسای وت ئامۆژگاریم بکە، ئەویش پێی فەرموو: سەیری نانەکەت بکە بزانە لەکوێوە دێت و سەرچاوەکەی لەکوێیە؟).

٢٨. سەیدنا عوسمانی کوڕی عەففان: (دەگێرنەوە کە عوسمانی کوڕی عەففان خواردنی چاك و پاشایانەی بۆ خەڵکی چێدەکرد و دواتریش کە دەچوویەوە بۆ ماڵ بۆخۆی خەل و زەیتی دەخوارد).

٢٩. نێو ماڵی ئازیزمان ﷺ: (گێڕدراوەتەوە کە لەنێو ماڵی ئازیزماندا، بۆ ماوەی مانگ، و مانگ، و مانگ نانیان نەکردووە).

٣٠. بەڕۆژووان: (بەڕۆژووەکان کاتێك دەچنە بەهەشتەوە دەڵێن بایەکی بۆن خۆش دێت کە بۆنەکەی ئێجگار خۆشە، پێیان دەڵێن: ئەمە بۆنی دەمی بەڕۆژووەکانە، ئینجا لای دۆزەخییەکانیش بۆنێکی ناخۆش دێت، و دەڵێن ئەی خودایە بۆنی لەوە ناخۆشترمان نەکردووە لەوەتەی هاتووینە نێو دۆزەخ، پێیان دەڵێن: ئەمە بۆنی دامێنی زیناکەرانە).

# شازدەیەم
# "کات" لە ڕەمەزاندا، باوەڕدەکەیت دوای هەموو شتێک تەنها ٦٠ کاتژمێرت بۆ بمێنێتەوە؟!

**کات:**

کـات، بـۆ مـرۆڤ گرنگیـی تایبـەتی هەیـەو بـۆ ناسـینەوە و ئاسانکاریش، بۆ چەندین جۆر دابەشمان کردووە، بەنموونە ڕابردوو، ئێستا، و داهاتوو. ئەمە ڕێك پێچەوانەیە بۆ خودای گەورە، چوون کات بۆ خودا هیچ ئەهمییەتێکی نییە، وەیان ڕەنگە ئەگەر هەڵە نەبم کات هەر بۆ ئێمەی مرۆڤە و بۆ خودا نییە! یانی خودا لەیەك کـات دەتوانێـت لـە ڕابـردوو، و ئێسـتا، و داهـاتوو بێـت! دەی ئەمـە ڕەنگە لەسەرووی ئیدراکی ئێمەی مرۆڤەوە بێت... هەرچۆنێك بێت مەبەستی ئێمە لە کات ئەوەیە کە پەیوەندی بەئێمەی موسڵمانەوە هەیـە لـە مـانگی ڕەمەزانـدا، ئـەمڕۆ دەمانـەوێت لێکدانەوەیـەکی بیرکاری بکەین بۆ سەرجەمی ٣٠ ڕۆژی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز. دەبێت ئەوەش بگوترێت کە ئەم لێکدانەوەیە بەشێوەیەکی گشتی وەرگیراوە و هەرکەس گەرەکی بێت دەتوانێت بۆخۆی بەگوێرەی هەڵسـان ودانیشـتنی کاتژمێرەکان کەم و زیاد بکات. بۆیە سەرەتا

سەیرێکی وێنەکە بکە و ئینجا بەپێی لێکدانەوەی خۆت خوێنەری ئەم بابەتە بە

**مەبەست لەم لێکدانەوەیە مەبەستە لەم ژماردن و لێکدانەوەیە ئەوەیە کە:**

- مانگی ڕەمەزان بکەیتە هەوێنی بەرهەم.
- هەر کەس گرنگی کات بەهەند وەرگرێت.
- ڕێکخستنی کاتەکانیش لەولا بوەستێت و بتوانیت هەمیشە خشتەیەکت هەبێت.
- تاوەکو بزانین ئەم کاتەی لە پەرستشەکان بەسەری دەبەین چەندە.

## ڕوونکردنەوەی خوارەزمی

*ئەگەر هەریەکێك لەئێمە کاتەکانی وەك ئەو وێنەیە بێت کە دامانناوە، ئەوا مانای وایە ئەو کەسە نزیکەی ٦٦٠ کاتژمێری بەسەردەبات و ٦٠ کاتژمێر دەمێنێتەوە، ئێستا با لەخۆمان بپرسین ئەم هەموو کاتە بۆ کوێ چوو، و چۆن بەسەرمان برد؟

*هەروەها با لەوەش بپرسین کە چەند و چۆن کاتمان لە هەموو جۆرەکانی پەرستش بەسەربرد؟

*کاتژمێرەکانی خەوتن بە نزیکەیی بۆ هەرکەسێك ٨ کاتژمێرە، ئەمەش مانای وایە کە تۆ لە تەواوی مانگی ڕەمەزان ٢٤٠ کاتژمێر بەخەوتن بەسەر دەبەیت، واتە تۆ لەکۆی ٣٠ ڕۆژی ئەم مانگی ١٠ ڕۆژ دەخەویت! یانی سێیەکی ئەم مانگە!

*هەروەها یەکێکی تر لەم کاتانەی کە بە ئاسانی لەدەستمان دەڕوات، کاتەکانی بەربانگ کردنەوە و پارشێو، و ئەوانی تره. ئەگەر بێت لە هەموو ئەو کاتانە تەنها چوار کاتژمێرمان لەدەست بچێت ئەوا مانای وایە کە لەتەواوی ڕەمەزاندا ٥ ڕۆژ ئێمە هەر خەریکی خواردن و خواردنەوە بووین، و ئینجا ئەمە لای خەڵکانێك هەر زیاتریشە و ئەوەندە هەر هیچ نییە!

*جگە لەوەش لەدونیای ئەمڕۆماندا کە بە ئامێرە زیرەکەکان دەور دراوین، ئینجا هەر لە مۆبایل بگرە تادەگاتە تەلەفزیۆن و ئایپاد، لاپتۆپ، و ڕادیۆ، و چەندانی تر... دیسانەوە ئەگەر هات و کەسێك لە هەموو ئەم ئامێرە زیرەکانە تەنا ٤ کاتژمێر بەسەرببات ئەوا وەکو پێشوو مانای وایە کە ٥ ڕۆژ لەتەواوی ڕەمەزاندا لەمەدا بەسەری بردووە! ڕەنگە بپرسن ئایا هیچ کەسێك هەیە هێندە کات بەسەر ببات بەدیار ئامێرە زیرەکەکان؟ وەڵامە هەر بەلای زۆرینەیە، تیایەتی هەر تەنێ چەند کاتژمێرێك بۆ زنجیرە ئەڵقەو فەوازیر و هاوشێوەکانی بەسەر دەبات، ئینجا مۆبایل و شتەکانی تریش هەر مەپرسن! کەوابوو لە چوار کاتژمێر زۆر زیاتر!

*بەگوێرەی ئەم دابەشکردنەی سەرەوە بێت، ئەوا مانای وایە

مانگی ڕەمەزان کە بە مانگی پەرستش و ڕۆژووو قورئان ناسراوە، لە ٣٠ ڕۆژەوە دەبێتەوەو تەنها ٥ ڕۆژ!

*تیایەتی بەم ڕاددەیە نییە کە باسکرا، بەڵام هێشتا هەر کات بەفیڕۆ دەدات، واتە ڕەنگە ٥ ڕۆژی بۆ نەمێنێتەوە بەڵکو ڕەنگە ١٠ ڕۆژی بۆ بمێنێتەوە! دەی هێشتا هەر دەکاتە سێیەك! وەکو لەسەرەتاشدا ئاماژەمان پێکردو تۆ دەتوانی بەگوێرەی ژیانی خۆت بەڕەچاوکردنی ئەم خشتەیە کاتەکانت حیساب بکەیت و پێداچوونەوەیەکی جوامێرانە بە کاتەکانت دا بکەیت!

دکتۆر موستەفا زەڵمی لە "کاروانی ژیانم" دا، دەڵێت: "٨٠% ئادەمیزاد زیاتر لە ٦٠ ساڵ ناژین، ئەم شەست ساڵەی نیوەی بەشەو و بەخەو تەواو دەبێت، تا چوار یەکێکی تەواو دەبێت کە پانزە ساڵە مرۆڤ چاکی و خراپی نافامێ و دەستی ڕاست و چەپی لەیەك جیاناکاتەوە، واتە ئەم ماوەیە بەژیانی ڕاستەقینە ناژمێردرێ و شەش یەکێکی لە ١٠ ساڵدا بە نەخۆشی و ئازار و ناخۆشی بەسەر دەبات کە هیچ سوود لەم ماوەیە وەرناگرێت، واتە لەو شەست ساڵەدا تەنیا (پێنج) ساڵی وەك ئادەمیزاد دەژی. ئەمە ژیان بێت ئایا شایستەی ئەوەیە مرۆڤ جگە لە چاکە و کاری بەسوود بۆ مرۆڤایەتی هیچ کار و کردەوەیەکی دیکە ئەنجام بدات". (ل.٩٠)

*هەر بە بۆنەی ئەوەی ئەمڕۆ ١٦ی ڕەمەزانە و نیوەی ڕەمەزان دوێنی تەواو بوو، ڕەنگە کەسانێك هەبن تا ئێستا زۆربەی کاتەکانیان لەدەست چووبێت، با بپرسین ئەرێ کار لەکار ترازاوە؟ بێگومان نەخێر، چونکە هەروەك گوتراوە درەنگ دەستپێکردن

باشترە لەوەی کە هەر دەست پێنەکەیت، تۆ ئەگەر لەمڕۆ دەست پێبکەیت، بەلایەنی کەم نزیەکی ٣٠٠ کاتژمێرت بەدەستەوەیە، بۆیە وریابە![1],[2]




(1) ٢. بۆ نووسینی ئەم بابەت سوودمان لە وتارێك وەرگرتووە بەناوی: خوارزميات رمضان لە نووسینی: عبدالعزيز سالم شامان الرويلي

لە پێگەی: https://www.saaid.net/mktarat/ramadan/٦٣٥htm.

(2) پەراوێز: ئەمڕۆ نزیک بە ئێوارە ١٦ی ڕەمەزان بۆ کارێک بەپەلە چوومە دەرەوە، لەنێوە سەیارەکەدا، ڕادیۆکەم داگیرساند کەسێک پەیوەندی بە مامۆستایەکی ئاینییەوە کرد و پرسیاری کرد: مامۆستا ئێمە کۆمەڵە برادەرێکین یاری کۆنکەن دەکەین بۆ کات بەسەربردن، ئایا ڕۆژووەکەمان بەتاڵ دەبێتەوە یان گوناهبار دەبین؟ بەڕاستی من سڕ بووم، ئێمە چۆن کاتمان دەست ناکەوێت و نازانین چی بکەین ئەم بەڕێزەش چی دەڵێت!، جا هەر بەتەنهاش نییە و کۆمەڵێکن! تۆبڵێی لەوانە خراپتر چۆن بێت، کە بێگومانم لەوەی زۆر نموونەمان هەیە!

# حەڤدەیەم
# خوێندنەوەیەکی نوێ بۆ جەنگی بەدر لە کتێبی (موحەممەد ﷺ سوڵتانی دڵان)

## سەرەقەڵەم

لەو ڕۆژانەی کە قوتابی سەرەتایی بووم، لەپۆلی پێنجەم دا، بۆیەکەم جار مێژووی ئیسلامی دەخوێنرا بەشێوەیەکی ئاسان، یەکێك لەو باسانەی کە لەم کتێبەدا بوو، باسی جەنگی بەدر بوو، مامۆستایەکمان هەبوو تا ساڵەکە تەواو بوو، چەندین جار ئەم قسەیەی دووبارە کردەوە، ئەویش ئەوەبوو: "کافرەکان هیچیان نەکردبوو، خەتای موسڵمانەکان بوو شەڕیان پێ فرۆشتن..." ئەمە لەوکاتەوە هەر لەلام پرسیار بوو، لەنێو چەندین سیرەدا گەڕاوم هەریەك و بەجۆرێك باسی هۆکاری هەڵگیرسانی جەنگەکەی دەکرد، و بەڵام بەگشتی زۆربەی لەوە کۆك بوون کە ئەم قافلەیەی کە لەشامەو دەهاتەوە و سەروەتیکی زۆری پێبوو، ئینجا موسڵمانەکان وەکو تۆڵەیەك، یان وەکو نیشاندانی بەهێزبوونیان، وەیان وەکو وەلام بۆ ئایەتی جیهاد... هتد. دەستیان کرد بە خۆئامادەکردن... بۆمن ئەمە وەلامێك نەبوو دڵمی پێ تێر ئاو بکەم!

چونکە ئەم مەسەلەی شەڕ فرۆشتنە هەر لەمێشکمدا مابوویەوەو ئیدی هەر لەلام بوو، تا سالآنێك لەمەوبەر کە چووم بەسەر شاکارێکی تری سیرەدا، بۆیە ئێستا سالآن تێپەڕین و کاتی خستنە ڕووی ڕاستییەکانە!

## هۆکاری ناونانی

جەنگی بەدر، شەڕی بەدر، یان بەدری گەورە، لەقورئاندا بە ڕۆژی فورقان ناسراوە، هۆکاری ناونانی بەم ناوە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو شوێنەیەی کە دەکەوێتە نێوان مەککە و مەددینە، کە تیایدا لە نزیك بیری "بەدر" ڕوویدا و هەندێك کیش ناوەکە دەگەڕێننەوە بۆ ئەکەسەی کە بیرەکەی لەوێدا لێداوە. هەرچۆنێك بێت ئەوە یەکەمین ڕووبەڕوبوونەوەی نێوا موسڵمان و ناـ موسڵمانان بوو. هەروەها ئەم شوێنە بە جێگەیەکی جوگرافیی گرنگیش هەژمار دەکرا بۆ تێپەڕبوونی قافلەی بازرگانی .

## کات

ئەم جەنگە لە ڕۆژێکی وەك ئەمڕۆ و لە ١٧ی ڕەمەزانی ساڵی ٢ی کۆچی ڕوویدا، و ئیبن کەسیر دەڵێت: کە لە ڕۆژی جومعەدا بووە.

**بە ژمارە**

ژمارەی موسوڵمانان: ٣١٧ وەیان ٣١٣ لە سەحیحی موسلیم هاتووە کە ٣١٩یە.

*ژمارەی نا. موسڵمانان: ١٠٠٠ وەیان زیاتر.

*ژمارەی شەهیدی موسڵمانان: ١٤.

*کوژاروی نا موسڵمانان: ٧٠ کوژراوو ٧٠ دیل.

لەڕووی سەربازییەوە: موسڵمانان دوو ئەسپ سوار لەگەڵ ٧٠ وشتر

نا موسڵمانان: ٢٠٠ ئەسپ سوارو ٧٠٠ وشتر، لەگەڵ تیرهاوێژ، و هەروەها درع (دژە. تیر).

**ستراتیژییەت**

*ئیبن ئوم مەکتووم لە مەدینە جێهێڵراو کرا بە سەرپەرشتیار و بەرپرسی نوێژ.

*موسعەبی کوڕی عومەیر وەکو سەرکردەی کەتیبەی موسڵمانان دیاریکرا کە بە ئاڵای سپی دەناسرانەوە.

*سوپاکە بەسەر دووبەرەدا دابەشکرا، موهاجیرین و ئەنسارِ، ئیمامی عەلی کرا بە ڕابەری موهاجیرین و سەعدی کوری مەعاز کرا بە ڕابەری ئەنسارِ.

## بەپوختی

ئەبو سوفیان کە سەرقافلەی کاروانە بازرگانییەکە بوو، کاتێ پێی زانی پێغەمبەر ﷺ و یاوەرانی بۆی هاتوون، ئەوەبوو ڕێگەی قافلەکەی گۆڕی و خەبەریشی نارد بۆ قوڕەیش بەوەی کە ماڵ و سامانیان لە ترسدایەو ئەوەبوو ئەوانیش بە سوپایەکی گەورەو بە چەك و تفاقی زۆرەوە بۆیان هاتن .

## کۆتایی جەنگەکە

کۆتایی جەنگەکە بە شکاندنی ئەوان و سەرکەوتنی موسڵمانان بوو، خودا لە قورئاندا بە ڕۆژی فورقان ناوی دەبات، کاتێك دەفەرمووێت: "یوم الفرقان یوم التقى الجمعان". واتە: ڕۆژی جیاکردنەوەکە (چونکە حەق و باتڵ جیاکرانەوە).

## خاڵی مەبەست

ئێستا با بگەڕێینەوە سەر خاڵی مەبەستی ئەم نووسینە، و باس لەهۆکاری هەڵگیرساندنی ئەم جەنگە بکەین و بزانین کێ سەرەتا ئاگرەکەی خۆشکرد، ئایا هەروا بەسانایی مەبەستی موسڵمانان شەڕ فرۆشتن بوو، ئایا مەبەستی موسڵمانان دەستگرتن بوو بەسەر سەروەتی ئەوان؟ یان چ هۆکاریکی تر بوو؟

ڕەشیت هایڵماز، کتێبێکی نووسیوە بەناوی (پێغەمبەر محمد ﷺ سوڵتانی دڵان)، ئەم کتێبە دوو بەرگەو من بە زمانی ئینگلیزی لەلامە، لە بەرگی دووەم دا لە لاپەڕە ١٦ دا دەڵێت: "پێشهات و بەرەوپێشچوونەکان بۆ قورەیش وای نیشان دەدا، کە ئەوان ئامادەکاری بۆ جەنگێکی گەورە دەکەن، ئەوان تەواوی کەل و پەل و سەروەت و سامانی موهاجیرینیان زەوت کردبوو، و دەیانویست هەموو ئەو کەل و پەلانە ببەن بۆ دیمەشق بۆ فرۆشتن، بە کورتی ئەوان پلانیان دانابوو کە هێرش بکەنە سەر موسڵمانەکان و بەهۆی ئەو پارەیەی کە دەستیان دەکەوێت لەفرۆشتنی کەل و پەلەکانیان دا، ئینجا ئەم قافلەیەی کە دەهاتەوە گەنجینەیەکی تەواوی لەسەر بوو، کە دەیکردە نزیکەی پەنجا هەزار درهەم، و لەلایەن چل پیاوەوە پاسەوانی دەکرا. دیارە ئەمەش پاڵپشتیەکی گەورە بوو بۆ قورەیش لە هێرش کردنە سەر مەدینەی موسڵمانان. بۆیە موسڵمانان هەستیان بەم مەترسیە کردبوو، دیاربوو کە سەرچاوە و ڕەگی مەترسییەکەش کە لەسەر ئەم قافلەیە بوو، بەنزیك مەدینەدا ڕەت دەبوو، بۆیە ئەمە هەلێك بوو بۆ موسڵمانان کە ڕێگە بگرن بە ڕوودانی ئەم مەترسییە."

لێرەوە دەردەکەوێت کە کێ سەرەتا ئاگرەکەی خۆشکردووە و کێ بەنیازی هێرشبردن و تیرۆر و قەڵاچۆکردن بووە، دیارە سەرانی قورەیش هەر لەوە نەترساون کە ڕۆژێك لە ڕۆژان دەوڵەتی شارستانی مەدینە بەهێز ببێت و تۆڵەی ڕۆژانی زوو بکاتەوە،

بەڵكو یەكێكی تر لەخاڵەكان ئەوەبوو كە ئەوان لەدڵیان ناخۆش بوو، و نەیاندەویست كە موسڵمانان لەهیچ شوێنێك بەرقەرار بن، دیارە كە داهاتووی موسڵمانان تەواو ڕوون بوو بۆ ئەوان، پێشتریش ئەوەبوو چەندین هەوڵی گەڕانەوەی ئەوانیان دابوو، ئینجا هەر لە حەبەشە بگرە تادەگاتە دەست تێكەڵكردن لەگەڵ جووەكانی مەدینە...

لێكدانەوەكەی دكتۆر ڕەشیت هایلماز بە پشتن بەستن بە چەندین سەرچاوەی ڕەسەنە، بۆ كەسێك كە حەز بە سیرە دەكات دەتوانێت ئەمە بپشكنێت، و بۆی دەردەكەوێت كە ئەمە بەڕاستی دەشێ وەك سەرچاوەیەكی گەورەی ئەكادیمیی دابنرێت بەتایبەت بۆ توێژەران.[1]

---

(١). سەرچاوەی سوود لێبینراو:

Prophet Muhammad (bpuh) The Sultan of Hearts (١-٢)

Resit Haylmaz.

## هەژدەیەم
## ئوممەتێکی چالاك لە ڕەمەزاندا

بەگشتی خەڵکان بەسەر دوو بەرە دابەش دەبن لە ڕەمەزاندا، ئەوانەی کە لە خواردن و خواردنەوەدا، نە لە پارشێو، و نە لە ئێوارەدا دەست ناگرنەوە و خۆگرتنەوە لەلایەن ئەگەر مەحاڵ نەبێت ئەوا زۆر ئەستەمە! ئەوانە، هەڵسانەوە لایان هێندە قورسە، مەگەر مرۆ هەر بەخەیاڵ وێنای بکات.

بەڵام بەرەکەی تر، جۆرە چالاکەکەیە، ئەوەی کە لە ڕەمەزاندا سپێدە زوو، دەچێتە کار، یان هیچ نەبێت خەوتووە، و نزیك بەنیوەڕۆ بۆ نوێژ دەچێت و دەست بە پەرستش دەکات، دواتر کارەکانی تری، و دواتر بۆ نوێژی عەسر و ئینجا وتاری عەسران، و دواتر کارەکانی تری، ڕەنگە دوای هەر نوێژێك دەست بە خوێندنەوە بکات، وەیان گەڕان بە دوای شتانێکی بەسوود لە ئینتەرنێت، ئێوارە بەهەمان جۆر، نوێژ و بەربانگ و هەروەها بۆ بانگی خەوتنانیش دیسانەوە نوێژ و پاشان تەڕاویح و چەندین چالاکی تر...

یـانی بەگشــتی و بــە پــوختی تــاکێکی چــالاك و هەســتیار و هۆشیار.

مەبەستی ئێمە ئەوەیە کە بۆچی لە ڕەمەزاندا هێندە چالاك بیت و دوای ڕەمــەزان چالاکییــەکانت نامێنێــت؟ لــەدوای ڕەمــەزان تـەڕاویح نامێنێـت، بـەڵام بـۆچی دەهێڵێـت ئـەم وزەیـە وا مانگێکـە دەستت خستووە و بووە بە نەریت و یاسای ڕۆژانەت ئێستا هەروا بەسانایی بەهەدەر بچێت! یانی هەر بە ڕژدی تۆ ئەوەت دەوێت؟!

کێشەکە هەر تەنیا پەرستشەکان نین، بەڵکو کێشەکە ئەوەیە کە تۆ دەتوانیت ئەم مانگە بکەیت بە سەرمەشقی گۆڕانی هەتا هەتایی، ئەمە ڕێك ئەو کاتەیە کە تۆ بۆ هەمیشە چاوەڕێی بوویت، ئەمە ئەو کاتەیە کە هەموو ساتێك تۆ بڕیاری گۆڕانکاریت دەدا، ئەو کاتەیە کە هەمیشە بۆ دەستپێکردن چاوەڕێی بووی، ئێستا تۆ لـەنێو ئـەم کاتـەدایت، و لـەنێو ئـەم چالاکییـە سەراسـیمە دەژیـت، ئەوەی لەسەر تۆیە تەنها بەرەوام بوونە، دڵنیابە کە بەردەوام بوون هێندەی ئەم دەستپێکردنە قورس و زەحمەت نییە.

## نۆزدەیەم
## گوایە دەڵێن:
## (ڕەمەزان و ڕۆژوو تەمەنی مرۆڤ درێژ دەكات!)

ڕەنگە زۆر لەئێمە گوێی لەم گوتەیە بووبێت كە دەڵێت: "خوێندنەوە تەمەن درێژ دەكات"، ڕاستییەكەشی ئەوەیە، خوێندنەوە دەبێتە هۆی زیاتر ژیان و زۆرتر بینین و دە هێندە زانین و چەندان شتی تر... ئەم كتێبەی كە ئەزموونی دە، بیست، سی، چل ساڵەی نووسەرە و وەیان زیاتریش، كە ئەزموونی تەواوی ژیانێكە، و كتێبێك بە چەندین ساڵ نووسراوە، خوێنەر ڕەنگە بتوانێت لەماوەی كەمتر لەمانگێك بیخوێنێتەوە! ئەمە یانی چی، ئەمە واتە تۆ لەبری ئەوەی چەند ساڵ بژیەیت و هەموو ئەو مشەخەتییە ببینیت، دەتوانی لەم ماوە كەمەدا هەمان ئەزموونی نووسەر بژیت... یانی ئەوەتا خوێندنەوە ساڵانی تری خستە سەر تەمەنت.

كتێبێكی زمان، فێری زمانی وڵاتێكت دەكات كە هەر نەت بینیوە! كتێبێكی پەروەردە ڕەنگە بتكات بە پەروەردەكارێكی سەر ڕاست...هیتر. ئەمانە واتە زیاتر ژیان، تەمەنێكی درێژتر، زیاتر زانین، زیاتر بینین...

ئـەی باشـە چـی لـەبارەی ڕەمـەزان و ڕۆژووە؟! یـەكێك كـە ڕەمـەزانێ لـەوی دیكـە زیـاتر ژیـاوەو بـەڕۆژوو بـووە، ئەمـە بـەر لەئەوی دیكـە لـەو دونیـا پاداشـت دەكرێـت، یـانی چـی، یـانی خۆی لەئەسـڵدا كـە تـۆ هـەر كـارێكی چـاك دەكـەیت، ئـەوە پاداشـتێكی دیاریكراوت هەیە و هەمووی ڕوونكراوەتەوە، بەڵام ئەمەی ڕۆژوو (إلَّا الصِّيَامَ؛ فإنَّه لي).[1] واتە: تەنها ڕۆژوو نەبێت ئەوەیان بۆ منە)، یانی خۆم پاداشتی دەدەمەوە.

نموونەیەكمان هێناوەو وتمان: كتێبێك ڕەنگە ئەزموونی تەواوی نووسەرێك بێت و خوێنەریش بە سانایی دەتوانێت ئەم ساڵانەی تەمەنی نووسەر بخاتە سەر تەمەنی خۆی لەڕێگەی خوێندنەوەی كتێبەكەوە، ئەی باشە كە تۆ نیاز و ئامانجت پەرستشە، و حەزت وایـە كـە دەمێـك زیـاتر بژیـت بـۆ ئـەوەی زیـاتر و زیـاتر پەرسـتش ئـەنجام بـدەیت، دەی ئـەوا لـە شـەوێكی وەكـو شـەوی قـەدردا، پاداشتەكەی هەزار مانگە، یانی تەنها شەوێك هەزار مانگ دەخاتە سـەر تەمـەنت! ئەمـە هـەر تـەنها بـۆ شـەوێك، ئـەی بـۆ ئـەم هـەموو ڕۆژوو، و نوێژ، و شەونوێژ، و بەخشین، و كارە مرۆڤدۆستییەكانی تر!

تۆ لەتەنها شەوێكدا بتوانیت هەزار مانگ بخەیتە سەر تەمەنت ئەی بەدرێژایی مانگەكە چی!

---

(1) البخاري (١٩٠٤).

پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەفەرمووێت: (یارب، جعلت أمتي أقصر الأمم أعمارا، و أقلها أعمالا). واتە: خودایە ئوممەتەکەم تەمەنیان کورتە و تەمەنی کورتیش کەم کاری چاکەی پێ دەکرێت. بۆیە خودا ئەم شەوەی بەخشی بەئوممەت تاوەکو هەر کەسێ ئەم شەوەی زیندوو کردەوە ئەوا بە ٨٣ی ساڵی تەمەن و زیاتریش ئەژمار دەکرێت!

وەکو ئاماژەمان پێدا، کە ڕۆژوو مادام بۆ خودایە، ئیدی هەر خۆی پاداشتەکەی دیاری دەکات، (الترمذی) هێناوەیەتییەوە کە ئازیزمان ﷺ فەرموویەتی (الصوم نصف الصبر)، واتە: ڕۆژوو نیوەی ئارامگرتنە. ئەمە یانی چی، سەرنجی ئەم ئایەتە بدەن: (إنما یوفی الصابرون أجرهم بغیر حساب). (الزمر:١٠)، واتە: بەڕاستی تەنها خۆڕاگران پاداشتیان بێ سنوور و بێ ئەندازەیە. لەتەفسیری ئیمامی قورتوبی دا هاتووە، کە مەبەست لە "خۆڕاگران" لێرەدا "بەڕۆژووبوانە".

ئێمە لێرەدا هەر تەنها باسی لایەنێکمان کرد، ئێوەش و پسپۆڕانی تەندروستی و ژیانبینی و بوارناسەکانی تر، دەتوانن بێ لایەنانە لەم بابەت بدوێن.

# بیستەم
# شەوێکی پێغەمبەر ﷺ لە دە شەوەکانی کۆتایی ڕەمەزان.

شەوانی کۆتایی مانگی ڕەمەزان وەیان شەوانی قەدر، جێگای گرنگی پێغەمبەر ﷺ و یارانی و شوێنکەوتووانی و هەموو ئەوانی تر بووە تا هەنوکە. لەم شەوانەدا کە قورئانی تێدا دابەزیووە، و فریشتەکانی خودا دادەبەزنە سەر زەوی، پاداشتی ئێجگار گەورەی هەیە، بۆیە ئێمەیش هەمیشە پرسیومانە ئاخۆ دەبێت ئازیزمان ﷺ ئەم شەوانەی چۆن بەسەر بردبێت، ئەم جۆرە پەرستشانە چی بوون کە لەم شەوەدا ئەنجامی داون، ئایا هەر تەنها لە مزگەوت ئیعتیکاف (مانەوە)ی کردووە، وەیان جۆری ئیعتیکافەکەی چۆن بووە، چی دوعایەکی خوێندووە و چۆن نوێژێکی کردووە و چەندان شتی تر.

## زیندووکردنەوەی شەوانی قەدر

جارێ بەر لە هەموو شتێك زیندووکردنەوەی ئەم شەوانە مانای ئەوەیە کە تۆ بەدرێژایی شەوەکان بێداربیت لە پەرستش و دڵت بێخەو بێت لە هەر شتێکی چاك. لەدایکمان عائیشەوە گێردراوەتەوە کە :"کان رسول الله ﷺ یجتهد في العشر الأواخر ما

لا يجتهد في غيره".[١] واتە: ئەوەندەی ئازیزمان ﷺ ئەوەندەی لەم دە شەوە پەرستشی کردووە ئەوەندە لەشەوانی تر نەیکردووە. خودای گەورە جێگەیەکی تایبەتی داناوە بۆ شەوی قەدر لە کتێبەکەیی، ئەوەتانێ لە سوورەتی قەدردا دەفەرموێت: (إِنَّا أَنْزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ ﴿١﴾ وَمَا أَدْرَاكَ مَا لَيْلَةُ الْقَدْرِ ﴿٢﴾ لَيْلَةُ الْقَدْرِ خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ شَهْرٍ ﴿٣﴾ تَنَزَّلُ الْمَلَائِكَةُ وَالرُّوحُ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِمْ مِنْ كُلِّ أَمْرٍ ﴿٤﴾ سَلَامٌ هِيَ حَتَّىٰ مَطْلَعِ الْفَجْرِ ﴿٥﴾

ئێمە بەڕاستی قورئانمان دابەزاندۆتە خوارەوە لەشەوێکی بەفەڕ و ڕێزداردا * جا تۆ چووزانی شەوی بەفەڕ کامەیە و چ خێر و بەرەکەتێکە * شەوی قەدری بەڕێز لە هەزار مانگ ڕێزدار و خێردارترە * لەوشەوەدا فریشتەکان کە جوبرەئیلیشیان لەگەڵدایە، دادەبەزن لەسەر ڕووخسەت و مۆڵەتی پەروەردگاریان، بەجۆرەها فرمان و کار * ئەو شەوە ئاسوودەیی و ئاشتی و هێمنی و ڕەحمەت و میهرەبانییە هەتا کاتی بەرەبەیان".

هەروەها لەسوورەتی (الدخان) دا دەفەرموێت: ﴿ إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةٍ مُّبَارَكَةٍ ۚ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ ﴾ الدخان:٣ واتە: بەڕاستی ئێمە ئەم قورئانەمان لەشەوێکی پیرۆز (شەوی قەدر)دا نازڵ کردووە، بەڕاستی ئێمە ترسێنەر بووین. لەو شەوەدا هەموو کارو کردەوەیەک بڕار ئەکرێن و لێک جیا ئەکرێنەوە .

(١) . سەحیحی موسلیم.

جگە لەوەش ئازیزمان ﷺ دەفەرمووێت: "من قام ليلة القدر إيمانا واحتسابا غفر له ما تقدم من ذنبه".[١] واتە: ئەوەی شەوی قەدر بە خودا پەرستی بباتە سەر، بەئیمان و باوەڕی دامەزراو و بەنیازی پاداشت و ڕەحمەت بێت، خودا لە هەموو گوناهێکی ڕابردووی خۆش دەبێت". هەر لە سوورەتی (الدخان) دا هاتووە: ﴿ فِيهَا يُفْرَقُ كُلُّ أَمْرٍ حَكِيمٍ ﴿٤﴾ ﴾ الدخان: ٤، واتە: لەو شەوەدا کار و کردەوە و بەرنامەیەکی پڕ لە حیکمەت و دانایی لەیەك جیا دەکرێنەوە.

## دیاریکردنی شەوی قەدر

ئەم مەسەلەیە ڕای جیاوازی زۆری زانایان و توێژەرانی لەسەر، بەڵام ئەوەی لەسەری کۆکن زۆربەیان ئەوەیە کە لە دە شەوی کۆتایی و لە شەوانی تاکدایە، واتە شەوانی: (٢١، ٢٣، ٢٥، ٢٧، ٢٩). سەرنجی زۆر لەسەر شەوی ٢٧ـە، بەڵام ڕایەکانی تریش فەرامۆش نەکراون، بۆیە لەم عەیامەدا زۆربەی موسڵمانان هەر دە شەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزان زیندوو دەکەنەوە.

## چ شتێك بەخواپەرستی حسێبە

زۆربەی موسڵمانان پرسیار لەبارەی ئەوەوە دەکەن، کە لەم شەوەدا چی بکەن؟ ئێمە سەرنجتان بۆ خاڵێك ڕادەکێشین ئەویش ئەوەیە، بەداخەوە زۆرینەی موسڵمانی ئەمڕۆ جگە لە نوێژ هیچ پەرستش و شتێکی تر نازانێت لە ئیسلامدا، زۆرینە نەخوێندەوارە

(١). سەحیحی بوخاری.

بە قورئان، زۆرینە نازانێت جۆرەکانی تری عیبادەت چین، بۆیە ئێمە ناڵێین کە نوێژ شتێکی کەمە، بەڵکو مەبەستی ئێمە ئەوەیە کە هەرتەنها نوێژ نییە تۆ بتوانی لەم شەوەدا بیکەیت، چوون چەندین ڕکات نوێژ ڕەنگە تووشی بێتاقەتی بیت و بوەستیت، بۆیە من سەرنجتان بۆ ئەم پەرەگرافە ڕادەکێشم لە ماڵپەری یەکێتی زانایانی کوردستانەوە وەرمانگرتووە سەبارەت بە شەوی قەدر:

"زۆر کەس نازانێ چ شتێك لەم شەوانە بە خێرو خواپەرستی حسێبە، هەیە وا دەزانێ تەنها نوێژ، هەیە بە پێچەوانەوە، بۆیە پێویستە بزانین هەموو کارو بارێکی خێرو چاك، تەنانەت نیازو مەبەستی چاك لەم شەوەدا بە خێرو پاداشت و خواپەرستی حسێبە، بۆیە لە هیچ شتێکدا کەم تەرخەمی مەکە، وەك ئەمانە: گێڕانەوەی نوێژ، نوێژ کردنی سوونەت، قورئان خوێندن، وتاردان، ئامۆژگاری کردن، گوێگرتن لە قورئان و وتار، زیکر کردن، سەردان کردنی خەڵك و مزگەوتەکان، خێرو سەدەقە کردن، خەڵوەو مانەوە لە مزگەوت، ئاشکردنەوەی خەڵك... وێڕای ئەوەی هەندێکیان لە هەندێکیان خێرو پاداشتیان باشترو زۆرترە، وەلێ هەمویان خێرو پێویستن، شەرتی نیاز پاکی و گیرا کردنی خوای گەورەیە."

هەروەها ئازیزمان بە دایکمان عائیشەی فەرمووە کە لەم شەوەدا ئەم دوعایە زۆر بکات: "اللهم انك عفو تحب العفو فاعف عنی".[١]

(١). ئیمامی ترمذی ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٨٠٢٥).

واتە: خودایە تۆ تۆ عەفویی و لێخۆشبوویت و لێخۆشبوونت خۆش دەوێ، و لێم خۆش ببە.

## ئازیزمان ﷺ لەشەوی قەدردا

هەروەك لەسەرەتادا ئاماژەمان پێدا، لە دە شەوی کۆتایی ڕەمەزاندا ئەوەندەی ئازیزمان ﷺ لەم دە شەوە پەرستشی کردووە ئەوەندە لەشەوانی تر نەیکردووە، هەروەها هەر لەسەحیحی موسلیم دا هاتووە کە: (کان رسول الله ﷺ إذا دخل العشر أحيا الليل، وأيقظ أهله، وجد وشد المئزر).[1] واتە: کاتێ ئازیزمان ﷺ دەگەیشتە دە شەوی کۆتایی ڕەمەزان، ئەوا شەوانی زیندوو دەکردەوە، و کەس و کاری بێدار دەکردەوە و خۆی توند دەکردەوە (یانی دووردەکەوتەوە لە سەرجێیی). جگە لەوەش دایکمان عائیشە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە دەشەوی کۆتایی لە مزگەوت دەمایەوە و ئیعتیکافی دەکرد، و تاوەکو ئەوکاتەی وەفاتی فەرموو، پاش ئەویش خێزانەکانی ئیعتیکافیان دەکرد. ئینجا کارێکی تر کە کردوویەتی ئەوەیە کەس و کاری و خێزانەکانی هەڵساندووە بۆ خواپەرستی.

بەکورتی واتە:

١. خۆی شەوەکانی زیندووکردۆتەوە (ئینجا بە شەونوێژ، قورئان،

(١). ئیمامی موسلیم ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٣٠٨٨).

زیکر و هەموو کارو کردەوەکانی تر کە لەسەرەوە باسکرا).

٢. کەس و کار و خێزانەکانی بێدارکردۆتەوە.

٣. دوورکەوتۆتەوە لە سەرجێیی.

٤. ئیعتیکافی (مانەوە) کردووە لە مزگەوت.

٥. ئینجا جگە لەم کارانەش، هەوڵ بدە کارەکانی تری ڕۆژان و شەوانی ڕەمەزانیش لەم شەوەدا بە ڕێك و پێکی ئەنجام بدەیت، وەکو (نوێژی بە کۆمەڵ، بەخشین، زۆر قورئان خوێندن کە ئەمە شەوی دابەزینی قورئانە، شەو نوێژ، تاخیرکردنی پارشێوەکەی، زۆر زیکر کردن و یادی خودا، و چەندانی تر...).

# بیست و یەکەم

## ئاگاداری دزەکانی شەوی قەدر بە!

## (حەوت ئامۆژگاری گرنگ)

ئەم شەوانە، شەوانی پیرۆزی قەدرن، قەدر گرتنیان لەسەر ئێمە پێویستە، هەر موسڵمانەو بەجۆریك لەجۆرەكان ئەم شەوانە زیندوو دەكاتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا، زۆرجار بەهۆی بێئاگاییمان ئەم شەوە بەتەواوی وە یان چەندێك لە كاتی ئەم شەوانە بەفیڕۆ دەدەین، بانگخواز و نووسەر و زانای گەورەی میسری، دكتۆر «أحمد عیسی المعصراوي»، لەئەژماری خۆی لەسەر تۆڕی تویتەر حەوت ئامۆژگاری جوان و گرنگی نووسیوە بۆ شەوانی قەدر، ئێمەش بەپێویستمان زانی بۆ ئێوەی بەڕێز بكەین بە كوردی، فەرموون خوێنەری بن:

١. ئیمامی شافیعی دەڵێت: شەوەكانی وەك ڕۆژانی وان، كەوابوو بەدرێژایی ڕۆژەكە لە كۆشش و پەرستش دابە، بەڕۆژ كاری چاكە بكە، بەڵكو خودا لەشەوەكەی پاداشتت بكات.

٢. شەوی دوعا و پاڕانەوەیە: باشترینی دوعا ئەوەتا لە نوێژا دەیکەیت، باشتر لەوە لەکاتی سوژدەبردندا، و لە هەموویش باشتر لەکاتی سەحەر .

بیرت بێت دوعاکانت درێژبکەرەوەو لەگەڵ گریاندا! (مەبەست لێی ئیلحاح کردنە).

٣. گەورەترین دوعا ئەمەیە: (اللهم إنك عفو تحب العفو فاعف عني).[١] واتە: خودایە تۆ لێبوردەیت و لێبوردنت خۆش دەوێ، و لێم ببوورە. ئەمە بەزمانێکی پڕ لە لێبوردنەوە بڵێ و پەشیمانی دەربڕە لەو هەموو کارە نابەجێیەی کردووتە بە درێژایی ساڵەکە و ئەگەرچی هەمیشە نیعمەتیشت لەسەربووە.

٤. کات بە هەدەردان کارێکی قێزەونە، ئەی ئەگەر لەشەوی قەدردا بێت چی!

٥. شەوەکەی مەخەوە و بێداربە!

ئەم شەوە لە خەوەکە بەنرخترە، و ئیعتیکاف بکە، و وەگەرنا شەوەکەی بە نوێژ و زیکر و دوعا ببەسەر، و بەکەمی دامەنێ، چوون بازاڕەکان تا بەرەبەیان هەر کراوەن!

٦. لەم شەوەدا سەرلەنوێ کارو کردەوە و بەرنامەیەکی پڕ لەحیکمەت و دانایی بۆ ساڵێکی تر دادەنرێت!

---

(١). ئیمامی ترمذی ڕیوایەتی کردووە بە ژمارە (٨٠٢٥).

کەوابوو بپارێرەوە بەم دوعایانەی پڕن لە حیکمەت و پەند، ڕەنگە مانایەکی زۆر لە چەند وشەیەکی کەمدا بێت.

**٧. ئاگاداری دزەکانی شەوی قەدر ببە!**

(تەلەفزیۆن، مۆبایلە زیرەکەکان، تۆڕەکانی کۆمەڵایەتی، بەربانگ کردنەوەیەکی درێژ و قورس، بازاڕکردن، سەردانی کردنی خێزانی...)

(ئەمانە دزەکانی شەوی قەدرن، و هەر ئاگاشت لێی نییە کە چەندە کاتت لێ دەبەن!)

# بیست و دووەم
# هونەری نزا و پاڕانەوە لای دوا پێغەمبەر ﷺ

لە شەوانی کۆتایی مانگی ڕەمەزانداین کە بە شەوانی قەدر ناسراون، ئەم شەوانە تیایدا موسڵمانان دەم بە دوعا و دڵ پڕ نزان، بەڵام زۆرێك لەئێمە نازانین ئاداب و هونەری دوعا چۆنە! ئایا هەر ئەوەیە کە تۆ بپاڕێیتەوەو تەواو ئیتر!؟ یان ڕەنگە لە هەمووی باشتر ئەوەبێت بگەڕێینەوە بۆ ڕێنموونی ئوممەت، حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ سەبارەت بە چۆنیەتی پاڕانەوە و تکاکردن. هەڵبەتە لەم بوارەشدا چەندین نووسراو تائێستا لەبەر دەستن، بەڵام یەکێك لە کتێبە جوانەکان، کتێبی (فن الدعاء والذكر عند خاتم الانبياء ﷺ:هونەری نزا و پاڕانەوە لای دوا پێغەمبەری ﷺ شێخ موحەممەد غەزالی یە. لەخوارەوە و سەرەقەڵەمێکی خێرا لەسەر بابەتەکانی ئەم کتێبە دەخەینە ڕوو.

**کتێبەکە**

لە دوا نووسینەکانی نووسەرەو، بەشێوەیەکی چڕ و پڕ باسی هونەری نزا و تکاکردن دەکات لە ژیانی پێغەمبەر ﷺ و لەوێشدا چەندین ئایەت و فەرموودە دەهێنێتەوە، لەگەڵ گەواهی یاوەرانیی.

ئەم چاپەی لەبەردەستی ئێمەدایە، لەدووتوێی ١٤٣ لاپەڕە لەلایەن (دار الاعتصام)ەوە چاپکراوە لە میسر.

## چۆن محمد ﷺ خودای بە ئێمە ناساند؟

نووسەر دەڵێت: من یەکێکم لەم نووسەرانەی کە باوەڕم بە پەروەردگاری مەزن هەیە، ئەم باوەڕەش دیارە لەڕێگای پێغەمبەرەوە ﷺ بوو، چوون قورئانم خوێند، پاشان ژیاننامەکەی، و دواتر وەڵامی فیترەتی پاکم دایەوە و چوومە پاڵ ئەو هەموو جەماوەرە زۆرەی کە "ڕازی بوون بەوەی خودا . الله . پەروەردگاریان بێت و موحەممەدیش ﷺ نێردراو یەپامهێنیان بێت".

لەپێشدا خەڵك بەمجۆرە خودای نەدەناسی و وایدەزانی ئەگەر منداڵێکی هەبێت ئەوا شەفاعەتی بۆ دەکات و، وە یان هاوەڵی بۆ خودا دادەنا... هیتر. کاتێکیش ئەو هات، ئیدی هەموو چوون بەسەر ناسینی تاکێتی پەروەردگار، ئینجا ئەوەی کە دانی نەنا، و ئەوەش کە چووە ژێر ئەم حەقیقەتە. سەرنجێکی گەردوون بدە و ئەو هەموو دروستکراوە ببینە و گەشتێك بۆ شوێنە هەرە دوورەکانی گەردوون بکە بە خەیاڵت، و ئینجا وەرەوە بۆ سەر زەوی و هەموو زانیارییەکانت بەراورد بکە! ئێستا وێنای پێغەمبەر ﷺ بکە کاتێ لەنوێژدا دەچووە ڕکوع و دەیفەرموو: (اللَّهُمَّ لكَ رَكَعْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَلَكَ أَسْلَمْتُ، خَشَعَ لكَ سَمْعِي، وَبَصَرِي، وَمُخِّي، وَعَظْمِي، وَعَصَبِي).

واتە: "خودایە بۆ تۆ چوومە ڕكوع و ئیمانم بە تۆ هێناو تەسلیمت بووم، بینین و بیستن و ئێسك و مۆخ و دەمارم هەموو ملكەچ و گوێڕایەڵی تۆن"، هەروەها كاتێك لە ڕكوع هەڵدەستایەوە دەیفەرموو: (للَّهُمَّ رَبَّنَا لكَ الحَمْدُ مِلْءَ السَّمَوَاتِ، وَمِلْءَ الأَرْضِ، وَمِلْءَ ما بيْنَهُمَا، وَمِلْءَ ما شِئْتَ مِن شيءٍ بَعْدُ). واتە: "پەروەردگارم بیسەری ئەو كەسە بوو كە ستایشی كرد، دەسا پەروەردگارا؛ گشت ستایش و پیاهەڵدانێ هەر بۆ تۆیە، بەئەندازەی تەواوی ئاسمانەكان و زەوی، و ئەوەی لەنێوانیان دا هەیە، و بەئەندازەی هەر شتێكی تر كە تۆ گەرەكتە"، پاشانیش كە دەچوو بۆ سوژدە و دەیفەرموو: (للَّهُمَّ لكَ سَجَدْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَلَكَ أَسْلَمْتُ، سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذي خَلَقَهُ، وَصَوَّرَهُ، وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ، تَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الخَالِقِينَ). واتە: "سوژدەم برد بۆئەوخوایەی كەدروستی كردووم، و بینین وبیستنی بۆدارِشتووم وپێ بەخشیوم بەتواناوبەویستی خۆی، پاكی وبێگەردی وبێ كەم وكورتی بۆئەوخوایەیە كەچاكترینی بەدیهێنەرانە". تۆ هەرتەنها سەرنجی ئەم موناجاتە بدە و ببینە كە چۆن تاكێتی و مەزنی خودا دەبینی لەلایەك، و لەلایەكی تریش ملكەچی و گوێڕایەڵی و بەندایەتی بۆ ئەم خودایە. لەڕێگەی ئەم وشانەوە مرۆ دەتوانێت ڕۆبچێتە حەقیقەتی تاكێتی پەروەردگار.

### خۆشەویستی بنچینەكەیە

سەرنج بدەن، كە فریشتەكان ناخۆن و ناخۆنەوە، و زەوی كێڵان

و درۆینـە و بابەتـەکانی تریـان لەسـەر نییـە، لەکاتێکـدا مـرۆڤ دەخـوات و دەخواتـەوەو هـەوڵی پەیـدا کردنـی خـواردن دەدات و هەموو هۆکارەکانی ژیانسازیی دەگرێتە بەر، بەڵام فریشتەکان هەر خەریکی تەسبیحات و ستایشی پەروەردگارن.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مرۆڤ هەر تەنها ئەگەر بێت و بەناوی خودا "بسم الله" دەست بەخواردن و خواردنەوە و کارو کاسبی و... هیتر. بکات ئەوا کاتەکەی وەکو کاتی فریشتان وایە کە هەمووی لـە زیکـر و سـتایش بەسـەر بردبێـت. خـوداش هـەر لـە گزیـدەی مێـژووەوە پێغەمبـەرانی لـە مـرۆڤ ڕەوانـە کـردووە بـۆ ئـەوەی ئـەم ڕێگایـە ڕوون بکەنـەوە، و هـەرگیز فریشـتەکانی بـۆ ئـەم تەکلیفـە ڕانەسـپاردووە، چونکـە ئـەم جـۆرە تەکلیفـە هـیچ پەیوەنـدی بـە فریشتەکانەوە نییـە. دوا پێغەمبـەریش ﷺ ئەوی ڕوونکردۆتـەوە کـە مـرۆڤیش دەتوانێـت لـە ئاسـتی فریشـتان دابێـت لـە زیکـر و سوپاسگوزاریدا. ئیمامی ئەحمەد و ئەبو داود و نەسائی لەڕێگەی زەیـدی کـوری ئەرقـەم گێڕاویەتیانـەوە کـە پێغەمبـەر ﷺ لـەدوای نوێژدا فەرموویەتی:

عـن زيـد بـن أرقـم قـال: سمعت رسـول الله ﷺ يَدْعُو فِي دُبُرِ كـل صَلَاة يَقُولُ: (اللهُمَّ رَبَّنَا وَرَبَّ كُلِّ شَيْءٍ، أَنَا شَهِيدٌ أَنَّكَ الرَّبُّ، وَحْدَكَ لَا شَرِيكَ لَكَ، اللهُمَّ رَبَّنَا وَرَبَّ كُلِّ شَيْءٍ، أَنَا شَهِيدٌ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُكَ وَرَسُولُكَ، اللهُمَّ رَبَّنَا وَرَبَّ كُلِّ شَيْءٍ، أَنَا شَهِيدٌ أَنَّ الْعِبَادَ كُلَّهُمْ إِخْوَةٌ، اللهُمَّ رَبَّنَا وَرَبَّ كُلِّ شَيْءٍ، اجْعَلْنِي مُخْلَصًا لَكَ وَأَهْلِي فِي كُلِّ سَاعَةٍ

فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ، ذَا الْجِلَالِ وَالْإِكْرَامِ اسْمَعْ وَاسْتَجِبْ، اللهُ الْأَكْبَرُ الْأَكْبَرُ، اللهُ نُورُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ، اللهُ الْأَكْبَرُ الْأَكْبَرُ حَسْبِيَ اللهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ، اللهُ الْأَكْبَرُ اللهُ الْأَكْبَرُ).[1]

واتە: "ئەی خودای ئێمە و خودای هەموو شتێك"

"من گەواهی ئەوە دەدەم کە تۆ خودای تاك و تەنهایت، و هیچ شەریك و هاوەڵێکت نییە"

"ئەی خودای ئێمە و خودای هەموو شتێك، من شایەتی دەدەم کە موحەممەد بەندە و نێردراوی تۆیە"

"ئەی خودای ئێمە و خودای هەموو شتێك، من شایەتی دەدەم کە بەندەکان هەموو برای یەکترن"

"ئەی خودای ئێمە و خودای هەموو شتێك، دڵسۆزم بکە بۆ تۆ و بۆ کەس و کارم، لە هەموو کاتێکدا لە دونیا و دوارِۆژدا".

"ئەی خودای خاوەنی ئەوپەڕی ڕێز و شکۆ، گوێبیستم بوویت و

(1) إسناده ضعيف: أخرجه أحمد (٤/ ٣٦٩)، وأبو داود (١٥٠٨)، والنسائي في (عمل اليوم والليلة) (١٠١)، وفي (الكبرى) (٩٩٢٩)، وأبو يعلى (٧٢١٦)، وفي (الدعاء) (٦٦٨)، والطبراني في (الكبير) (٥١٢٢)، وفي (الدعاء) (٦٦٨)، وابن السني في (عمل اليوم والليلة) (١١٤)، والبيهقي في (الأسماء والصفات) (٢٧٢)، وفي (الشعب) (٦١٣)، وفي (الدعوات الكبير) (٩٤)، والمزي في (تهذيب الكمال) (٨/ ٣٨٧-٣٨٨)، والشجري في (أماليه) (١/ ٢٤٩) عن معتمر بن سليمان التيمي.

وەڵامم بدەرەوە"

"خودا گەورەترینی گەورەترینە، نوری ئاسمانەکان و زەوییە"

"خودا گەورەترینی گەورەترینە، پشت و پەنام هەر تۆیت و تۆش باشترینی پشت و پەنایت"

"خودا گەورەترینی گەورەترینە"

سەرنج لەم وشانە بدە، بە نموونە، یانی چییە کە ئەو بڵێت: شایەتی دەدەم کە موحەممەد بەندە و نێردراوی تۆیە؟! مانای وایە کە ئەو هەڵگری ئەمانەت و پەیامێکە و دەبی بیگەیەنێت، ئینجا با هەر نکۆڵی لێبکەن و باوەڕی پێنکەن!

## ٢٤ کاتژمێر لەژیانیی

با ئێستا وێنای ئەوە بکەین، کە تەنها ڕۆژێك لە ژیانی ئازیزمان ﷺ بێنینە بەرچاومان. وادابنێ کە ئێستا بەر لە بەیانی لەخەو هەڵساوە، هێشتا تاریکایی شەوی بەبەر ماوە و، ئەو دەفەرمووێت: (الحمد لله الذی رد علی روحی، وعافانی فی جسده، وأذن لی بذکره).[1] واتە: تۆ سەرنجی ئەوە بدە چۆن دەست بەڕۆژەکەی دەکات! بێگومان بە سوپاسگوزاری، چوون ئەو تەمەنەی بە ئێمە

(١) .ئیمامی ترمذی گێڕاویەتیەوە بەژمارە (٣٤٠١)، وە ئیمامی نسائی لە ((السنن الکبری)) هێناویەتی بەژمارە (١٠٧٠٢).

دەدرێت لە هەموو ڕۆژێکدا ئیدی ئەمە چانسێکی تری ژیانە. جا باشتر وایە کە تۆش بۆ باشترینی کارەکانی ژیانت بەکاری ببەیت. ئینجا ئەم پێغەمبەرە ﷺ سوپاسگوزارە وشانێکی تر دەڵێت کە پڕن لە حیکمەت و دانایی و سوپاسگوزاری و تکاکاری، ئەو دەفەرموێت: (اللهم إني أسألك العفو والعافية في الدنيا والآخرة، اللهم إني أسألك العفو والعافية في ديني ودنياي وأهلي ومالي، اللهم استر عوراتي وآمن روعاتي، اللهم احفظني من بين يدي، ومن خلفي، وعن يميني، وعن شمالي، ومن فوقي، وأعوذ بعظمتك أن أغتال من تحتي).[١]

واتە: "پەروەردگارا داوای لێخۆشبوون و پارێزگاری لەتۆ دەکەم لە دونیا و دواڕۆژدا، خودایە داوای لێ خۆشبوون و پارێزگاریت لێدەکەم لە ئایین و دونیا و خانەوادە و سامانمدا، خودایە عەیب و ناتەواوی و کەم و کورتییەکانم داپۆشە، خودایە ترس و دڵە ڕاوکێیم مەهێڵە، خودایە پێش و پاش و ڕاست و چەپم پارێزراو بکە لە خراپە و شەڕی شەیتان و بشم پارێزە لە سەروومەوە لە بارینی خەشم و قین و غەزەبی خۆت بە سەرمدا، خودایە پەنا دەگەرم بە گەورەییت لەوەی، کە لە ژێرمەوە سزا بدرێم ."

ئەبوبەکری سددیق دەفەرموێت، پێغەمبەر گیان ﷺ پێی

(١) .ئیمامی ئەبو داود گێڕاویەتیەوە بە ژمارە (٥٠٧٤)، وە ئیمامی نسائی گێڕایتیەوە بە ژمارە (٥٥٣٠)، وە ئیبن ماجە گێڕاویەتیەوە بە ژمارە (٣٨٧١)، وە ئیمامی أحمد گێڕایتەوە بە ژمارە (٤٧٨٥).

فەرمووم كاتێ ئێوارە یان بەیانیت بەسەر داهات بڵێ: (اللَّهُمَّ عَالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ، فَاطِرَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ، رَبَّ كُلِّ شَيْءٍ وَمَلِيكَهُ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلهَ إِلا أَنْتَ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ نَفْسِي، وَمِنْ شَرِّ الشَّيْطَانِ وَشِرْكِهِ، وَأَنْ أَقْتَرِفَ عَلَى نَفْسِي سُوءًا، أَوْ أَجُرَّهُ إِلَى مُسْلِمٍ).[١] واته: "خودایە ئەی زانا بە شتە پەنهانی و ئاشكراكان، ئەی بەدی هێنەری ئاسمانەكان و زەوی، ئەی پەروەردگار و پادشای هەموو شتێک، شایەتی دەدەم بەوەی، كە هیچ پەرستراوێک شایستەی پەرستن نییە، جگە لە تۆ، خودایە پەنا دەگرم بە تۆ لە خراپەی نەفس و دەروونم، هەروەها لە خراپە و شەڕی شەیتان و ئەو شتەش، كە بانگەشەی بۆ دەكات، هەروەها لەوەی، كە دەروونم هانم بدات بۆ ئەنجام دانی خراپەیەک، یان خراپەیەک بەرامبەر موسوڵمانێک بكات".

ئینجا لە بەرەبەیاندا پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی دەفەرموون: (أَصبحنا عَلَى فِطْرَةِ الإِسْلام، وَعَلَى كَلِمَةِ الإِخْلاص، وَعَلَى دِينِ نَبِيِّنَا مُحَمَّدٍ ﷺ، وَعَلَى مِلَّةِ أَبِيِّنَا إِبْرَاهِيمَ، حَنِيفًا مُسْلِمًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ).[٢] واته: (بەیانیم بەسەردا هات لەسەر ئایینی ئیسلام و

(١) . ئیمامی ترمذی گێڕاویەتیەوە، بە ژمارە (٣٥٢٩).

(٢) . إسناده حسن: أخرجه النسائي في (عمل اليوم والليلة) (١/ ٣٤٣، ٣٤٤)، وفي (الكبرى)، (٢٩، ٩٨، ١٠١٧٥، ١٠١٧٦)، والدارمي (٢٦٨٨)، وأحمد (٣/ ٤٠٧)، وابن أبي شيبة (٩/ ٧٧) (١٠/ ٢٣٩)، وابن السني في (عمل اليوم والليلة) (٣٤)، والطبراني في (الدعاء) (٢٩٤)، والبيهقي في (الدعوات الكبير) (٢٦)، وابن حجر في ((نتائج الأفكار)) (٢/ ٣٧٩)، ومسدد في (مسنده) كما في (اتحاف الخيرة المهرة) (٨١٦٦)، وأبو

لەسەر شایەتی دان بە (لاَ إِلـهَ إلاَّ اللّٰهُ، وَمُحَمَّدٌ رَسُولُ اللّٰهِ) و لەسەر ئایینی موحوممەد ﷺ و لەسەر بەرنامە و ڕێبازی باوە گەورەمان ئیبراهیم ؛، کە بریتی بوو لە وازهێنان لە هاوبەش دانان و چون بەرەی یەک خودا پەرستی، هەروەها دوور و بەر و بوون لە هاوبەش دانەران).

دەبینن نەك هەر لەم دوعایە، بەڵکو لەچەندین شوێنی تر ئەمە دووبارە بۆتەوە کە خۆی دەفەرمووێت: ئەو لەسەر ئایینی موحەممەدە! باشە ئەمە مانای چییە؟! ئەمەش دیارە چەندین مانا لەخۆ دەگرێت لەوانە جەختکردنەوە لەسەر ئەوەی کە جەنابیان بەردەوامە لە پەیامەکەی، هەروەها ئەو پەیامە ئەمانەتە و دەیگەیەنێتە جێ، و ئینجا هەستکردن بەو نیعمەتە گەورەیەی خودا کە جەنابیان ڕاسپێردراون بەم پەیامە...هتد.

پاشان پێغەمبەر ﷺ لەوساتەوەی کە چاوەکانی کردۆتەوە هەستی لەسەر نیعمەتەکانی خودایە، ئەم سوپاسگوزاریەش بەم

---

عمر وأحمد بن حازم بن أبي غرزة الغفاري في (مسند عابس الغفار وجماعة من الصحابة رضي الله عنهم) (٤١)، وأبو القاسم البغوي في (معجم الصحابة) (١٩٣٠)، وأبو الفضل الزهري في (حديثه) (٣٤١ - رواية الحسن بن علي الجوهري)، وابن طولون في (الأحاديث المائة المشتملة على مائة نسبة للصانع) (٣٨)، والرافعي في (التدوين) (٤/ ٤٢)، والمستغفري في (الدعوات) كما في (داعي الفلاح) للسيوطي (ص ٤١) من طريق سفيان الثوري عن سلمة بن كهيل عن عبد الله بن عبد الرحمن بن أبزي عن أبيه قال: (كان رسول الله ﷺ ...) فذكره.

وشانە دەردەبڕێت: (اللَّهُمَّ مَا أَصبح بي مِنْ نِعْمَة أَوْ بأَحَد مِنْ خَلْقكَ، فَمنْكَ وَحْدَكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ، فَلَكَ الْحَمْدُ وَلَكَ الشُّكْرُ). واتە: (خودایە هیچ بەخشش و نیعەمەتێک نییە پێمەوە و ڕۆژی لەگەڵمدا کردبێتەوە، یان بە یەکێک لە دروستکراوەکانتەوە، ئەو بەخششە نەبێت، کە لە لایەن تۆی تاک و تەنیای بێ هاوەڵەوە نەبێت، هەروەها ستایش و سوپاسیش هەر بۆ تۆیە).

جا تۆ وێنای ئەوە بکە چەندە جوانە یەکێك کە ڕۆژ دەکاتەوە بە سوپاسگوزاری خودا، و لەدڵەوە ئەمە تۆمار دەکات و بە زوبانیش دەیڵێت. ئەوساش خودای گەورە وەڵامی دەداتەوە و دەفەرمووێت: بەندەکەم ڕاستی وت!

لە ئەبی مالکی ئەشعەری گێڕدراوەتەوە کە پێغەمبەر گیان ﷺ فەرموویەتی : ((أَصبحنا و اصبح الْمُلْكُ لله رَبِّ الْعَالَمينَ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ خَيْرَ هَذَا يوم فَتْحَهُ، وَنَصرَهُ وَنُورَهُ، وَبَرَكَتَهُ، وَهُدَاهُ، وَأَعُوذُ بكَ مِنْ شَرِّ مَا فِيهِ وَشَرِّ مَا بَعْدَهاُ)). واتە: (بەیانیم بەسەردا هات و موڵک و سامانیش بەیانیان بەسەردا هات هەر بۆ خودای جیهانیان، خودایە من داوای چاکەی ئەم ڕۆژەت لێدەکەم، وەکو: گەیشتن بە ئامانج و سەرکەوتن بەسەر دوژمندا و ڕۆزی پاک و هەڵبژاردنی ڕێگەی ڕاست، پەناشت پێدەگرم لە شەڕ و خراپەی ئەم ڕۆژە وئەوەیش، کە بەدوایدا دێت)، و پاشانیش کە ئێوارەی بەسەردا هات هەمان شت بڵێت و تەنها وشەی بەیانی بگۆڕێت بە ئێوارە.

ئینجا ئێمە واین وا لە خزمەت تەنها بیست و چوار کاتژمێر، کە

پڕیەتی لە دڵبەندبوون بە مزگەوت و نوێژی بە کۆمەڵ، هیچ نەبێت لە پێنج جار کەمتر نییە، و هەر جارێکیش چەند نوێژی سوونەتی لەگەڵدایە. لەگەڵ هەر هەنگاوێکیش بۆ مزگەوت ئەوا چاکەیت بۆ دەنوسرێت و گوناهێکت بۆ دەسڕێتەوە و پلەیەکیش بەرز دەبیتەوە. لە ئیبن عەبباسەوە هاتووە کاتێ جەنابیان ﷺ گوێبیستی بانگ بووە و چووە بۆ نوێژ فەرموویەتی: (اللهم أجعل فی قلبی نورا وفي لساني نورا وفي سمعي نورا وفي بصري نورا ومن فوقي نورا ومن تحتي نورا وعن يميني نورا وعن شمالي نورا ومن امامي نورا ومن خلفي نورا اللهم اعطنی نورا).

واتە: پەروەردگار لە دڵم، زوبانم، بیستن، بینین، سەرم، خوارم، ڕاستم، چەپم، لەپێشم، لەدواوەم، هەمووی بکەرەو نوور وە خودایە نوورم پێببەخشە."

ئینجا ئەوە بوو خوداش ئەوەی پێبەخشی کە داوای دەکرد، ئەوەتانێ خودا دەفەرمووێت:

﴿ وَدَاعِيًا إِلَى ٱللَّهِ بِإِذۡنِهِۦ وَسِرَاجٗا مُّنِيرٗا ٤٦ ﴾ الأحزاب: ٤٦، واتە: (هەروەها بانگەواز دەکەیت بۆلای خوا لەسەر مۆڵەتی ئەو تۆ نورێکیی یان چرایەکی ڕووناکیشیی (بۆ سەرجەم سەرگەردانان). ئەوەتانێ ئەو دڵی بە مزگەوتەوە پەیوەستە، بەمەش دوعاکەی ئیبراهیم پێغەمبەری عليه السلام دەوتەوە ﴿ رَبِّ ٱجۡعَلۡنِي مُقِيمَ ٱلصَّلَوٰةِ وَمِن ذُرِّيَّتِيۚ رَبَّنَا وَتَقَبَّلۡ دُعَآءِ ٤٠ ﴾ إبراهيم: ٤٠، واتە: پەروەردگارا،

خۆم و نەوەکانم بگێڕە لەو کەسانەی کە ئەنجامدەری نوێژ بین بەچاکی، خودایە دوعا و نزام گیرا بکە. کاتێك تۆ سیرەی ئەم نازدارە ﷺ دەخوێنیتەوە دەبینیت سەرتاپای نوێژە (و قرت عینی فی الصلاة).

ئینجا لەڕیوایەتێکیشدا هاتووە کە ساتێ پێی ناوەتە نێو مزگەوت فەرموویەتی: (أعوذ بالله العظيم وبوجهه الكريم وسلطانه القديم من الشيطان الرجيم). ئیدی بەمجۆرە پەنای گرتووە بە خودا لە شەیتان. وەیان لەڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە فەرموویەتی: (اللهم اغفر لی وافتح لی ابواب رحمتك). خودایە لێم خۆش ببە و دەرگای ڕەحمەتی خۆتم بۆ ئاوەڵا بکە.

ساتێ کە قورئانی دەخوێند، دڵەکان لە چێژیی ئەمە دەکەوتنە ملکەچی تەواو.

### لەکاتیرخواردن و خواردنەوەدا

فرمانی کردووە بەر لە خواردن و خواردنەوە ناوی خودا بهێنین و پاشانیش کە تەواو بووین (الحمدلله: سوپاسگواز) بکەین، چونکە فەرموویەتی کە خودا لە بەندەیەك ڕازی دەبێت کاتێك خواردن یان خواردنەوەیەك دەخواتەوەو سوپاسگوزار دەبێت لەسەری. دواتریش بەچەند دەنکە خورمایەك ئیکتیفای کردووە .

## کۆڕی پێغەمبەر ﷺ

لــە زانســـتی دەروونناســـیدا، مــرۆڤ گــەر بەتــەنها بێــت و بیربکاتەوە، ئەوا دەگاتە ئەوپەڕی بیرکردنەوە، بەڵام کاتێك تێکەڵ بـە خـەڵکی دەبێـت پلـەی بیرکردنـەوە دادەبـەزێت، بـەڵام ئەمـە بـۆ پێغەمەر ﷺ پێچەوانە بوو! تۆ تەنها سەیری کۆڕی ئەو بکە بزانە لە چ ئەندازە و پلەیەکدابووە!

### شەوی سپی

ئیتر بەمجۆرە ئەم ڕۆژە درێژە کۆتایی دێت و هەموو دەگەڕێنەوە ماڵەوە بۆ پشوودان، و پێغەمبەرگیانیش ﷺ بەمجۆرە، بەڵام ئایا ئەو بەمـە ڕازی دەبێـت؟! لەڕاسـتیدا ئـەو بـە شـەویش قۆنـاغێکی تـری ژیـانی دەسـتپێدەکرد، ئـەم شـەوەی بـە کـەمێك خـەو، بەدەسـتنوێژ و دوعا، و پاشانیش ڕابوون و شەونوێژ سپی دەکردەوە.

# بیست و سێیەم
# شەونوێژ

شەونوێژ، لە شەوانی کۆتایی ڕەمەزاندا و جگە لە ڕەمەزانیش هەمیشە جێگەی تایبەتی هەبووە، و لەژیانی ئازیزیشماندا ﷺ ئەوا هەر مەپرسن! ئەو، هەرگیز دەستبەرداری شەونوێژ نەبووە لە هەموو حاڵەتێکدا، لات سەیر نەبێت گەر بڵێین ئەگەر شەو بۆی نەکرابێت ئەوا بەڕۆژ قەزای کردۆتەوە، فەرموون خوێنەری ئەم کورتە نووسینە ببن، لە کتێبی (من الطارق، أنا رمضان) وەرمانگرتووەو کردوومانە بەکوردی:

**شەونوێژ:**

.ئازیزمان ﷺ هەرگیز دەستبەرداری شەونوێژ نەبووە، گەر نەخۆش بووبێت و وەیان توانای نەبووبێت ئەوا بە دانیشتەوە کردوویەتی، ئەی تۆ چی، موسڵمانی تەندروست؟!

.ئازیزمان ﷺ ئەگەر لەبەر جیهاد، وەیان بانگخوازی نەیتوانیبوایە کە شەونوێژ بکات ئەوا لە ڕۆژدا قەزای دەکردەوە، ئەی تۆ چی کە هەمیشە دەستت بەتاڵە و نازانیت کاتە بەتاڵەکانت بەچی پڕ بکەیتەوە؟!

. ئازیزمان ﷺ کاتێ گوێی لەبانگی کەڵەشێر دەبوو دەچوو بۆ میحراب، لە کاتێکدا ئەو سەروەری هەموو خواپەرستان بوو، باشە ئەی تۆ چی کە سەروەری هەموو گوناهکارانی، وەیان هیچ نەبێت لە گوناه و تاواندا پڕۆفیشناڵیت؟!

. ئازیزمان ﷺ بەیاوەرانی دەفەرموو کە هەڵسنەوە بۆ شەونوێژ و ئەوانیش هەڵدەستانەوە، لەکاتێکدا ئەوان (خیر القرون: باشترینی سەددەیەك کە ئەوانی تیا بوو) بوون، ئەی لەبارەی ئەم سەددەو سەردەمەی ئێستا کە نوقمی بێئاگایین؟!

## بانگەوازی فریشتان

ثابیتی بەنانی دەڵێت: نوێژ هۆکارو خزمەتی خودایە لەسەر زەویدا، ئەگەر شتێ لە نوێژ باشتر هەبووایە ئەوا خودا نەیدەفەرموو: ﭼﭽ ﭞ ﭟ ﭠ ﭡ ﭢ ﭣ ﭤ ﭼ آل عمران: ٣٩، واتە: "جا یەکسەر جوبرییل بانگی کرد لەکاتێکدا زەکەریا لەمیحرابەکەدا وەستابوو، نوێژی دەکرد".

ئینجا ئەگەر ئەمە سەبارەت بە نوێژ بێت بەشێوەیەکی گشتی، کەوابوو بۆ شەونوێژیش بەهەمان شێوەیە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (وأفضلُ الصلاةِ بعدَ الفريضةِ صلاةُ الليلِ).[1] چاکترین نوێژ دوای نوێژە فەرزەکان، شەونوێژە. دیارە نهێنی ئەم

(1) مسلم (١١٦٣).

نـوێژەش لـەوە دایـە کـە ئازیزمـان ﷺ فەرموویـەتی: (أقربُ ما یکونُ الربُّ من العبدِ في جوفِ اللیلِ الآخرِ فإنِ استطعْتَ أن تکونَ ممن یذکرُ اللهَ في تلْكَ الساعَةِ فکُنْ).[1] "نزیکترین کاتێك کە خودا لە بەندەکانی نزیك بێت ئەوا لەکۆتایی شەوە، ئەگەر توانیت لەم کاتەدا زیکر و بیری خودا بکەیت ئەوا بیکە.

بێدارکردنەوەی ماڵەوە

.بە سەحیح دانراوە لە ئازیزمانەوە ﷺ کاتێ شەو لە دەرگای ماڵی ئیمامی عەلی و فاتیمەی داوە و فەرموویەتی: ئەرێ نوێژ ناکەن؟!

.ئیمامی عومەر چەندە حەزی لێبووایە بە شەو نوێژی دەکرد، تا دەگەیشتە نیوە شەو، ئینجا ماڵەوەی بێدار دەکردەوە و دەیفەرموو: نوێژ .. نوێژ. پاشان ئەم ئایەتەی دەخوێند: ﴿ فَنَادَتْهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَهُوَ قَآئِمٌ يُصَلِّي فِي ٱلْمِحْرَابِ ﴾ طه: ١٣٢، واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەی ئیماندار، فەرمان بدە بە هەموو تاکەکانی خێزانت، تا نوێژەکەیان (بەچاکی ئەنجام بدەن، چونکە خۆراکی ڕۆحە) و بەردەوام و کۆڵنەدەر و خۆڕاگربە لەسەری ئێمە بێگومان داوای ڕزق و ڕۆزی لەتۆ ناکەین، بەڵکو ئێمە ڕزق و ڕۆزی بە تۆ دەبەخشین، سەرەنجامی چاك هەر بۆ خواناسی و دینداریە.

(1) أخرجه الترمذي (٣٥٧٩)، والنسائي (٥٧٢).

. عەبدولواحیدی کوڕی یەزید، هەموو شەو کەس و کاری لە خەو هەڵدەستاند و دەیگوت: ئەی ئەوانەی لەم ماڵەدان، ئێرە هەر جێگەی خەو نییە، بەم زوانە دەبن بە خۆراکی کرم و مێروو!

. خێزانەکەی حەبیبی ئەبی موحەممەد لەشەودا ئاگاداری دەکردەوەو دەیگوت: شەو ئەوا چوو، و ئێمەیش ڕێگایەکی درێژ و زادێکی کەمان لەبەردەستە، کاروانی ساڵحان ئەوا بە بەردەماندا گوزەشت و ئێمەیش لێرە جێماین.

ئا بەمجۆرە شەونوێژ دەبێت بە زمانێکی ستاندارد کە هەموو قسەی پێدەکەن، دەبێت بە ئاوازێك هەموو ئەندامانی خێزان دەیچڕن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێشتاش تێبینییەکەی ئیبن قەییم بۆ ئێستای ئێمە زۆر گونجاوە کاتێك وتی: داخۆ ئێستا چەندە کەس هەن ڕۆڵەکەیان ئیهمال کردووە، و فێری ئادابی ناکەن، بەڵکو یارمەتیشی دەدەن لە بەدواکەوتنی هەوەسەکانیی، ئینجا ئەوانە لایان وایە کە ڕێزی مناڵەکەیان دەگرن لەکاتێکدا بێڕێزی بەرامبەر دەکەن، لایان وایە کە ڕەحم بە مناڵەکەیان دەکەن لەکاتێکدا وا زوڵمی لێدەکەن.

# بیست و چوارەم
# ئەگەر ئەمە دوا ڕەمەزان بوو...!

ئەگەر ئەمە دوا ڕەمەزانمان بوو، ئایا توێشووی پێویستت کۆکردەوە بۆ ڕۆژانی تەنیایی؟! ئەی هیچ نەبێت ڕووی ئەوەمان هەیە داوا بکەین کە خودا بمانگەیەنەتە ڕەمەزانێکی تر؟!

سەرنج بدە، دوو هەفتە بەر لەئێستا پیرۆزبایی مانگی ڕەمەزانمان دەکرد، کەچی ئێستا واین لە کۆتاییەکانی، و خەریکەماڵئاوایی لێدەکەین، هەروەك چۆن ساڵانی پێشووش ماڵئاواییمان لێکرد، ئەوەی کە چاندووتە ڕەنگە لە داهاتوویەکی نزیکدا دروێنەی بکەی. کە هیچیشت نەچاندووە ئیدی بەنیازی دروێنە مەبە. زۆرێك لە ئێمە بیانوو و، بیانگەی چاندووە! دەبینین کە هیچ شتێکی چاکت نەکرد، تەنها بە بیانوو هێنانەوە ڕۆژانت بەڕێکرد، بیانوو هێندە ترسنۆکە، هەموو کەسێك پێدەوێرێت، هەموو کەسێك دەتوانێت دابنیشێت و ڕۆژ تا ئێوارە خەریکی بیانوو هێنانەوە بێت، بەڵام وەکو دەڵێن: "کردار پیاوی دەوێ"!

خاڵێکی تر ئەوەیە، زۆرێکیش لەئێمە بەڕۆژوو بووە و کاری چاکی کردووە، بەڵام هەر هێندە هەیە کە ئەم چەند ڕۆژە کەمەی

ماوە، ڕۆژانی تایبەتن و چەندە دەکرێت، با دە هێندە خۆمان یەکلا بکەینەوە بۆ پەرستشەکان. تەنێ هەر بە جەستە نەبێت، با دڵیش ئیدی ئیعتیکاف بکات.

ئازیزمان ﷺ دەفەرموویّت: (اغتنِمْ خمسًا قبل خمس : شبابَك قبل هَرَمِك، وصِحَّتَك قبل سَقَمِك، وغناك قبل فقرِك، وفراغَك قبل شُغلِك، وحياتَك قبل موتِك).(1)

واتە: پێنج شت بکە دەرفەت بەر لەوەی پێنج شتت بێتە پێش: گەنجایەتیت بەر لە پیریت، لەشساغیت بەر لە نەخۆشیت، دەوڵەمەندیت بەر لە هەژاریت، بێکاریت بەر لە سەرقاڵیت، ژیانت بەر لە مەرگت.

ئەم فەرموودەیە بەرنامە و سەرمەشق و پلانی تەواوی ژیانە.

خاڵی یەکەم: ئەوەتانێ باسی تەمەن دەکات، و ئاگادارت دەکاتەوە و بەر لەوەی توانا و هێزی گەنجێتیت بڕوا و، لەدەستی بدەیت و بەر لەوەی بێ توانا بیت لە کردنی هەر شتێکی چاك ئەوا ئەم فرسەتە بقۆزەرەوە.

خاڵی دووەم: ئەوەیە کە تەندروستی و لەشساغیت بەر لە نەخۆشیت بکەیتە فرسەت، ڕەنگە زۆرێك لەئێمە نەزانێت کە نەخۆشی تەواو چییە، سەرێك لە نەخۆشخانەکان بدەن، مانای

(1) أخرجه ابن أبي الدنيا في (قصر الأمل) (١١١) واللفظ له، والحاكم (٧٨٤٦)، والبيهقي في (شعب الإيمان) (١٠٢٤٨).

نەخۆشی تەواو دەزانین، و دەبینین لە هەموو تەمەنێك و ڕەگەز و ڕەنگێـك، جۆرەهـا نــەخۆش هــەن کــە بەحەســرەتی کاتژمێرێــك ساخڵەمین!

خاڵیکی سێیەم: دەوڵەمەندو هەبوونت بەر لە هەژاریت، جارێ با بێین ئەم خاڵە بخەینە ژێر وردبینی ویژدانەوە، مانای دەوڵەمەندی چییە! کە تۆ ئێستا لە ژیان پێداویستییەکی وات لێ کەم نییە بۆ ژیانسـازیی و ژیـانکردن و گوزەرانـدن، ئیـدی مانـای وایـە کـە تـۆ دەوڵەمەندی، نازانم بۆچی خۆت بە دەوڵەمەند نازانیت کە دەتوانیت خـەرجی هـەموو ڕۆژێکـت هـەبێت و پێداویسـتییەکانی ماڵەکـەت هـەموو دەسـتەبەر بکـەیت، بـۆچی لات وایـە کـە دەوڵەمەنـد واتـە هــەموو شــتێکی زیــادە، خــانووی زیــاد، و ســەیارە و کۆمــەڵێك پێداویســتی کــەهیچ گــەرەکت نییــە! کــەوابوو ئێســتا کــە تــۆ دەوڵەمەندی ئەم فرسەتە بکە بە چانسی ژیانت.

خاڵی چوارەم: ئەوەیە کە تۆ بێکاری و دەستبەتاڵیت بقۆزیتەوە، ئەم خاڵە لەم ماوەیەی کەرەنتینە بۆ هەموو ئوممەت وەدیارکەوت، ئـەوەتانێ لـەم ماوەیـەدا زۆربـەی خـەڵکی بێکـار کـەوتن لەماڵـەوە، بەڵام چەندێك لەئێمە توانی ئەم فرسەتە بقۆزتەوە، بۆ کردنی کارە کەڵەکەبووەکانمان!؟

خاڵی پێنجەم: دواخاڵیش، ژیانت بەر لە مەرگت، بەرلەوەی لە پڕ مـەرگ دەسـتبخاتە گـەردنی هـەر یـەکێکمان و خـاڵیمان بکاتـەوە لـە ژیـان. بـەر لـەوەی ئەمـە دوا ڕەمـەزان بێـت. ئیـدی ئەمـە فرسـەتە

زێڕینەکەی تۆیە .

اللهم أعد علينا شهر رمضان أعواما عديدة، وأزمنة مديدة، ونحن في صلاح و ثبات، و صحة و عافية.

پەروەردگار، ساڵانێکی تری زۆر شادمان بکەیەوە بە ڕەمەزان و لەکاتێکــدا لەســەر چــاکیی و دامــەزراوەیی و تەندروســتی و پارێزراوی دابین.

# بیست و پێنجەم

## ڕەمەزانی ساڵی ٢٠٥٠!

ساڵ ساڵی ٢٠٥٠.یە، ڕێکەوتی ١٨. ٥. ٢٠٥٠، تەنها سێ ڕۆژی ماوە بۆ مانگی ڕەمەزان، خەڵکێك خەریکی ئامادەکارین بۆ پێشوازی ئەم مانگە، مزگەوتەکان سەرلەنوێ پاك دەکرێنەوە و ڕووناك دەکرێنەوە، هەر کەس کە بۆی دەلوێ خەریکە فانۆسی ڕەمەزان لە حەوشەکە هەڵدەواسێ، و لەبیری پلانێکی چاکدایە بۆ ئەم مانگە، مناڵێك کە دوای هەنگاوەکانی باوکی کەوتووە و قاچەکانی بەدوایدا نایەن و وەك ئەوەی لەقوڕدا چەقیبن، تاو تاوێك نووزەیەکی لێوەدێ و چاوی گلەیی هەڵدەبڕێت، باوکی کە میهرەبانی لێدەبارێت ئاوڕێك دەداتەوەو دەیکاتە باوەش و هەناسەتەنگی دادەمرکێتەوە، و قۆپچەی سەرەوەی کراسەکەی دەکاتەوە، و وەك ئەوەی بایەك لە مەنفاوە هەڵیکردبێت و گیرفانی پڕ دەکات لە فێنکی، ئەگەرچی مانگی ئایارە، بەڵام بەهار هێشتا هەر ڕۆژ نا ڕۆژێ خۆی مەڵاس داوە و جارە جارە کە پەنگی خواردۆتەوە و سەر دەردەکات.

باوك؛ بەکۆڵێ بارەوە ماچی تەوێڵی ڕۆڵەکەی دەکات، کە تازە

مانگێـك لـە پێـنج سـاڵی تێپـەڕی کـردووە، و ناتوانێـت منـداڵێکی ئاوەها لەباوەش بکات و بەسۆزەوە دایدەنێت و دەڵێت:

. کـاری خـودا چەنـدە سـەیرە! دەڵێـی ڕەمـەزانی سـاڵی ٢٠٢٠."ە هێشـتا باوك تـەواو قسـەکەی لەدەم نەپژاوە، ڕۆڵەکەی بە دەمی پڕ لەپرسیارەوە دەپرسێت.

+ ئاخۆ ڕەمەزانی ساڵی ٢٠٢٠ چۆن بووبێت! باوك بەدەم ڕێگەوە دەست دەکات بە گێڕانەوە:

. ڕەمـەزانی ساڵی ٢٠٢٠ یەکێك لە ڕەمەزانـە سـەیرەکانی تەمـەن بوو، بە ڕەمـەزانی سـەردەم و ساڵی کۆڕۆناکە دەناسرێتەوە، بوەستە ئێسـتا دەڵێـی کۆڕۆنـا یـانی چـی، ڕۆڵـە هێشـتا زووە بـۆ کۆمـەڵێ پرسـیار، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشدا هەوڵدەدەم هـەموو شـتێکت پێبڵێم. مـن وامـدەزانی ئیـدی لەمـەو پـاش منـاڵان زیـت و زرنگـن و پێویسـتیان بـەم پرسـیارانە نابێـت، بـەڵام لـەوە دەچێـت تـا ڕۆژی نەفخی سوور، ئەمە هەر بمێنێت. مەبەستم ئەمەی کە دەڵێت: ئێمە کاتی خۆی ئاواو ئاوا بووین. باپیرانمان بەمجۆرە بوون، ئەم چەشنە کردارەیان ئەنجام داو...هیتر. وامدەزانی کە ئیتر بۆ هەتا هەتا کەس پرسیار لە ڕابردوو ناکات، بەڵام تەواو پێچەوانە بوو!

ڕەمەزانی ساڵی کۆڕۆناکەش، کەش و هەوا هەر بەمجۆرە بوو، فێنـك، خـۆش، و کـەس هەسـتی بـە تینـوێتی نـەدەکرد، بـەڵام هیچکامێـك لەئێمـە نەمانـدەتوانی بڕۆینـە دەرەوە، ئـەوە تـەنها

جیاوازی گەورەیە لەنێوان ئەم دوو ساڵە، ئەوکات ڕەمەزان هەر لەمانگی پێنج دا بوو، بگرە لە کۆتاییەکانی ڕەمەزان بووین، تا نیوەی ڕەمەزان نەمانتوانی بچینە مزگەوتەکان، هەموو شتێك یاساغ بوو، لەماڵەکاندا کەرەنتینە بووین،

+ ئا دەزانم کەرەنتینە یانی دەبوو لەماڵەکان نەیەینە دەرەوە تەنها بۆ کاری زۆر پێویست نەبێت.

. بەڵێ، کێشەکەش هەموو ئەم ڤایرۆسە بوو، مەبەستم ئەم ڤایرۆسی کۆرۆنایە... کە ئێستا بوو بە بەشێك لەمێژوو .

باوك سەرێك هەڵدەبرێت و سەیر دەکات چەند هەنگاوێك ماوە بۆ ماڵەوە، لەشەقامەکە دەپەڕنەوە و بەڵێنی ئەوە دەدات لەماڵەوە گێڕانەوەکەی بۆ تەواو بکات.

لەماڵەوە دوای وچانێکی کورت، باوك هەمدیسان دەچێتەوە دەرەوە، منداڵ کە تامەزرۆی بیستنی تەواوی چیرۆکەکەیە، ئەمجارە پەنا بۆ دایکی دەبات بۆ ئەوەی گێڕانەوەکەی بۆ تەواو بکات. لەلایەکی تریش باوك کە سەرلەنوێ چۆتەوە دەرەوە بۆ ئامادەکارییەکانی مانگی ڕەمەزان، هەر لەبیری ئەم ساڵەدایە، ئەو عادەتی وابوو هەموو ڕەمەزانێك بەر لە دەستپێك تەواوی کەرەستە و پێداویستییەکانی دەکڕی و دوای ئەوە بەدەگمەن نەبێت بۆ شت کڕین نەدەچوو بۆ دەرەوە، چوون ئەو ئەم مانگەی تەواو لەلای تایبەت بوو، لەم مانگەدا ئەو لە جەوێکی تەواو

جیاواز دابوو، زۆرترینی کاتی لە پەرستشەکان بەسەر دەبرد، و بۆ ئەم بیست جزمەی قورئانیش کە لەبەریکردبوو، هەر گاهێ بۆی لوا بووا دەورەی دەکردەوە. ئەوڕۆژە جیاواز لە سالآنی تر کەوتبووە بیری ڕەمەزانی سالّی کۆڕۆناکە.

ئێستا کە ٣٠ سالّ بەسەر ئەو ڕەمەزانە تێپەڕیووە، ئەو داخێك دایگرتووە، و ئاخێك لەسەر دلّیەوە سەری دەرکردووە، و هێور هێور ڕێگا تەی دەکات و بیر لە گرانییە مۆدێرنەکەی ئەو سالّە دەکاتەوە، گرانییەکی تەواو مۆدێرن بوو، خەلّکی بە پارەیەکی زۆر؛ کە نەبوو، شتانێکی کەمیان دەکڕی، بەلّام بەبێ ئەوەی تەنانەت هەستیشی پێبکەن، لەجۆرێك لە بەنجبوون دەچوو! بیری لەوە دەکردەوە کە چۆن ئەوسا خەلّکی کەوتنە گیانی هاوکاری یەکتری و نەیانهێشت ڕووی نەداری بەکەسەوە دیار بێت و چوون بەدەم یەکترەوە! بیری لەم ڕۆژانە دەکردەوە کە لەتەلەفزیۆنەکە خەلّك پەیوەندی دەکرد و دەیپرسی کە پارەی زەکاتی سەرفیترەی نییە! کە غەیری ئاو هیچ شتێکی تر نییە بەربانگی پێبکاتەوە، بۆ ساتێ غەمگینی تەواو وەکو تەم بالّی دەکێشایە سەری، لەپڕ هیوای بیرێکی تر دەهاتەوە کەللەی، ئەوساتەی هەر لە تەلەفزیۆنەکە کەسانێکی تر پەیوەندیان دەکرد و داوای ناونیشانی ئەو کەسەیان دەکرد بۆئەوەی یارمەتی بدەن.

جارێکی تر بایە فێنکەکە دەیداوە لەو هێندە قژەی کە بەسەریەوە مابوویەوە، دەهاتەوە ئەم دونیایە و دەچوو بۆ دوکانی

سووچەکە و، ئەو کە ساڵانێکی زۆرە لای خاڵۆ تەمەر، خورما دەکڕێت، ساتێ لای دادەنیشێت و پرسیاری ڕەمەزانی ساڵی کۆڕۆناکەی لێدەکات و خاڵە تەمەریش بەکوردییەکەی، کەهێشتا کاریگەری لەهجە عەرەبییەکەی بەسەرەوەیە وەڵامی دەداتەوە، خاڵە تەمەر یەکێك بوو لەوهەموو ماڵە عەرەبەی کە دەمێك بوون و لێرەبوون و لە زووێکەوە منداڵەکانی خستبوویە بەر خوێندنی کوردی، پێچەوانەی ماڵە عەرەبەکانی تر، و هەموویان لەماڵەوە بە کوردی دەئاخفتن، و ئەویش ساڵانێکە لەم دوکانی سەر سووچە خەرێکی فرۆشتنی خورمایە، خۆرما بە هەموو جۆرەکانییەوە، ئەو شارەزاییەکی باشی لەم بوارەدا هەبوو. پێیدەگوت: ئەمە شیشیی سەعودییە، ئەمە عەجوەی مەدینەیە بە تایبەت هاتووە لە بۆ ئەمن (هێشتاش کێشەی هەبوو لە دەربڕین و بەتایبەت لە ستەرەکچەری ڕستەدا)، ئینجا دوو جۆر سوکەرییهان هەیە، سەعودی و ئیماراتی، ئەمەش زەهدی ئێراقییە و ئەوەی خوارەوەش ئێرانییە، ئەو گەورە فەڵەستینیە، ئەگەر ڕووتاب و خورمای بەسرەشت دەوێ ئەوە لێرە ئەمن هەموو دانایە... ئیدی بەمجۆرە موشتەرییەکانی بەڕێدەکرد، بەڵام ئەمڕۆژە لەلای دانیشتبوو، ئەویش کەوتبوویەوە ئەم بیرە، بۆی باس دەکرد: باوەڕت بێت مامۆستا حکومەتی ئەوکات مووچەی لێبڕین (ئیمە دەستکاری ستەرەکچەری ڕستەکانی خاڵە تەمەرمان کردووە بۆ ئاسانکاری) تەنها بۆ ئەوەی بگەڕێینەوە، بەڵام من بە دایکی ئەحمەدم گووت: چۆن چاوم جارێکی تر

دەتوانێت بڕوانێتەوە کەرڕادە و چۆن دەتوانم ئیدی ئێوارانێك بچمەوە سەر دیجلە و کوڵی دڵی خۆم لەوێدا هەڵڕێژم، پاش ئەم هەموو ناسۆریەی بەسەرمان هات، پاش ئەوەی خزم و خوێشم بوون بە خۆڵەمێش، باوەڕت بێت مامۆستا قەراری ئەبەدی بوو و ئیتر بردمە سەری، و ئێستاش ئەوەتا وا لێرەم. ئا باسی چیم دەکرد... باسی ئەوساڵە، مامۆستا دوای ئەوەی حکومەت مووچەکەی بڕین، ئیدی ئێمە کەوتینە بارودۆخێکی ناخۆش و بەماوەیەکی کەم هەموو داهاتەکەمان خەرجکرد، ئینجا هاتین شتەکانی ماڵەکەمان هەڕاجکرد، و هێشتاش هەر لە هەژاریدا بووین، چونکە ئێمە ٩ سەر خێزان بووین و خەرجییان زۆربوو، ئیدی کە ساڵی کۆڕۆناکە ڕەمەزان بوو، دڵم نەختێ تەڕ بوویەوە بەوەی وتم: بەڵکو خێرومەندێك بتوانێت یارمەتیان بدات، بەڵام دایکی ئەحمەد هەرزوو هەڵی دایە و وتی: کەس خێر بە ئیمە ناکات ئێمە عەرەبین و هەموو ئەوە دەزانن، دوایە چەند ساڵە ئێمە مووچەی تەواو وەردەگرین ئەو داماوانە نیوە موچەو وەیان کەمتر و هەندێکاریش نیوەساڵیك وەریناگرن ئەی چۆن دەتوانن خێر بەئێمە بکەن!.

ڕاستی بڵێم دڵم بچووك بچووك ببوویەوە، و زۆر بێتاقەت بووم، ئاخر مامۆستا وابزانم تۆش لەبیرتە، بەڵام سوپاس بۆ خوا، فەزڵی خودا لەسەرمان بوو، هەروەك ئێستاش هەر لەسەرمانە، ئێوارەیەك نازانم لەکوێ و چۆن دووکەس خۆیان کرد بەماڵەکە و داوای منیان کرد، ئیدی بەعەرەبی دەستیان بە قسە کرد، من هێشتا کوردییەکەم

ئەوەندە باش نەبوو بتوانم قسەی پێبکەم و تێیبگەم. پێیان وتم: کە بیستوومانە تۆ هەژاری و شتێکی ئەوتۆت نییە، بەڕاستی من هەروامدەزانی کەس ئاگای لەحاڵی من نییە، بەڵام خودای بێکەسان، دیاربوو دراوسێکانم ناونیشانی منیان دابوو پێیان. باوەڕت بێت مامۆستا وامدەزانی دروسێکانم هەر نامناسن، بەڵام بەخوا ڕاست نەبوو، ئەم دوو پیاوە ئەو ئێوارەیە یارمەتییەکی باشی ئێمەیان دا، خودای گەورە لێیانخۆشبێت و دەست بە باڵییانەوە بگرێت، بەڕاستی مەرد بوون، ئینجا من کە باسی حاڵی خۆم بۆ کردن، ئیدی ئەوانیش ڕێنیشاندەرم بوون و وتیان کە باشترە دەست لەکارێك گیربکەم، ئیدی هەر ئەوەش بوو ئەوەتا وا ٣٠ ساڵە من ئەم دوکانەم هەیە، سوپاس بۆ خودا ماڵەکە دەژیەت و تەواوی پێداویستییەکانمان دەستەبەر دەکەین، ساڵێکی هەم خۆش و هەم ناخۆش بوو... باشە مامۆستا چۆن کەوتیتە بیری ئەوساڵە؟

مامۆستا کە لەسەر کورسییەکە دانیشتبوو، تەواو تەرکیزی لەسەر قسەکانی خاڵە تەمەر بوو، ئەوەبوو وتی: نازانم چی بڵێم منداڵەکەم پرسیاری لێکردم، منیش مشتێك لەخەرمانێکم خستە دەستییەوە، بەڵام دوای ئەوەی ئەوم بردەوە ماڵەوە ئیدی تەواو گەڕامەوە ڕابردوو.

ئیدی لەوێدا خورماکەی کڕی ماڵئاوییی لە خاڵە تەمەر کرد، و پاشان تەنیا ڕێگەکەی گرت، بەبیردا چوو، بەخۆی دەگوت، من لەو ساڵەدا هەموو شتێکم لەدەست دا و هەموو شتێکیشم دەست

کەوت، ئەوەی بەسەر مندا هات نازانم ئاخۆ چۆن و بە چ زمانێك بۆ ڕۆڵەکەم بگێرمەوە، ناتوانم ڕستەکانم ڕێك بخەم و وشەکانم لەوە زیاتر سادەتر بکەمەوە! دواجار زەردەپەڕی ئێوارە تێکەڵ بە خەیاڵەکانی دەبێت و "مرحبا .. مرحبا .. یا شهر رمضان.." بیرۆکەکانی دەپچڕێنیت و سەری دادەنەوێنێت و لەسەر شۆستەکە وچانێك دەدات و خەیاڵێکی گەورەتر دەیباتەوە، خەریکە پلانێك دادەنێت بۆ گێرانەوەی بەسەرهاتی خۆی، بەسەرهاتە گەورەکە، ئەو چیرۆکەی ژیانی گەڕەکەکەی لە کۆڕۆنا ڕزگارکرد، بەڵام ئەمە هەر تەنها چەند چرکەیەکە و هۆڕینی سەیارەیەکە دەیخاتەوە ئەم دونیا فانییە و لەوە دەچێت دەستەوەستان بێت لە گێڕانەوە! لای ناخۆشە کە ناتوانێت ئەم چیرۆکە بگێڕێتەوە، و لای وایە ئەم چیرۆکە پتر لە هەموو کات بۆ ئێستا پێویستە! بەڵام...

# بیست و شەشەم
# ئەلف و بێی ڕەمەزان

ئـەلف و بێـی ڕەمـەزان بریتیـە لـە هـەموو ئـەو شـتانەی کـە لـەم مانگەدا فێری بووین، فەرموون ئەمەش ئەلف و بێیەکە:

**(ئــەلف)** ئــەوین: ئەوینــداریی و ئــەڤینی خــودا و ئازیزمــان ﷺ، یەکــەم لەڕێگــەی قورئــان و دووەمــیش لەڕیگــەی فــەرموودە و ژیاننامەیی و بوون بە ئاوێنەی ئێمە.

**(بـێ)** بەخشـین: فێربـووین چۆن ئازیزمـان ﷺ لـە ڕەمەزانـدا وەك (با) دەیبەخشی و بەخشینی کردبوو بە سەر مەشقی کارەکانی.

**(پـێ)** پەنـد: سـەرتاپای مانگەکـە هـەمووی هـەر پەنـدە، ئینجـا لـە ڕۆژو و گرتنـەوە بگـرە تـاوەکو بچـووکترین هەڵسـان و دانیشـتن، پارشێوەکەی، شەوان... هیتر.

**(تــێ)** تۆمــار: هــەرچی شــتێك کــە کردوومانــە، لــە گــەورە و بچووکی، تۆماردەکرێت، تۆمارکردن لەئاستێکی زۆر بەرزدایە، هەر بەتەنها بە ناوهێنانت دەشێ فایلەکانت هەمووی بێنەوە بەردەست،

بەنموونـە کاتێـك تـۆ ناسـنامەکەت هـەڵگرتووە، ڕەنگـە هـەر نـاوێ سیانی و کۆمەڵێك زانیاری بچووکی تری لێنوسرابێت، بەڵام ئەگەر ئـەم ناسنامەیە ببەیتـەوە ئـەم فەرمانەگەیـەی کـە لـەوێوە دەرکـراوە، ئـەوا بـە گەڕانـەوە بـۆ فایلەکـەت ورد و درشـتی زانیارییـەکانت پـێ دەڵێن، ئەمە تۆماری مرۆڤە، ئاخۆ تۆماری خودایی چۆن بێت**!** (هەر لەپیتی تێ تەڕاویحیش هەیە)

**(جـیم)** جـوانی: ئاشـنا دەبـین بـە جـوانی تـر، نـەك هـەر جوانییـە ئاسـاییەکان، بـەڵکو جـوان وەك چـەمکێکی تـر وەردەگـرین و تێیدەگـەین و تێگەیشـتنی هەریەکـەمان بـۆ ئـەم جوانییـە جیـاواز دەبێت.

**(چیم)** چاوپێکەوتن: ئەم مانگە وەکو چاوپێکەوتن وایە لەگەڵ میوانێکی ئەزیز و شیرین، بۆ ماوەی مانگێك لەلات دەمێنێتەوە و ئیتر خۆت و مەردی خۆت، ئاخۆ چۆن مێوانداریيەکی دەکەیت**!**

**(حێ)** حەز: لەنێوان پارێزکاری و حەزەکانت چی هەڵدەبژێریت؟ ئەمە یەکێکی تـرە لەوانـەکان، کـە هەمیشـە زاڵبـوون بەسـەر حەزدا کردۆتە ئامانج.

**(خـێ)** خوێندنـەوە: لـە ڕەمەزاننامـەکانی پێشـوو باسـمان کـرد کـە فرمـان نـەکراوە بـە ڕۆژووی عـەقڵ، کـەوابوو یـەکێك لەپێویستییەکانی ئەم مانگە خوێندنەوەیە.

**(دال)** دوعـا: ڕەمـەزان لەگـەڵ دوعـا لێـوان لێـوە و نـاکرێ و نـابێ

ئەم مانگە بێ دوعا بێت، بەڵکو بۆ زۆرینەی موسڵمانان ئەم مانگە سەرتاپای دوعایە. لەشێواز و چۆنیەتی دوعاش ئەوا ئیدی دەبێت ئێستا کە لەکۆتاییەکانی ئەم مانگەین تەواو فێربووبین.

**(ڕێ)** ڕۆژوو: وانەی ڕۆژوو هەر ئەوە نییە کە تۆ لەم مانگەدا بەڕۆژوو بیت، و بەڵکو ڕەمەزان وەکو قوتابخانەیە هەوڵ دەدات بۆ هەمیشە فێری ئەم سوونەتەت بکات، واتە: لەدوای ڕەمەزانیش.

**(زێ)** زیکر: جۆرێکی تر لە پەرستشەکان لەم مانگەدا فێری بووین و هەمیشە دەمان پێیەوە تەڕ بوو، زیکر بوو. ئێستا کە هەمووکات لێوت بە زیکر تەڕە، هیچ شتێك ڕێگر نییە کە دوای ڕەمەزانیش وابیت.

**(ژێ)** ژان: فێربووین، کە ژانی ئەم هەموو ئازارە چەندێکە، ژانی نەخواردن، و تینوێتی، ژانی هەستکردن بە هەژاران و نەخۆشان، ژانی ئەم تەمەنە جوانەی هەموو ڕۆژێکی لە ئێمە دەڕوات...هیتد.

**(سین)** سوود: جیاوازی تەواو لەنێوان سوود و زیان، و سەرەتاش ڕۆژوو وەکو چەندەها سوودی دونیا و دواڕۆژ، سوودەکانی ئێستای وادیارە کە هەریەك لە سوودی مەعنەوی و تەندروستی و وەیان جەستەیی، و سوودی دواڕۆژیش ئەوا پاداشتەکەی لای پەروەردگاری مەزنە و ئەو هەر خۆی دەزانێ چەندێکە.

**(شین)** شەو: شەوانی ڕەمەزان، وەکو شەوانی ئاسایی ساڵ نین، ئینجا لە هەموو شتێکەوە، لەشەوانیدا هەر لە تەڕوایح بگرە تا دەگاتە پارشێو، هەموو شتێکی جیاوازە، لێرە دا ئێمە جۆرێکی تری شەو دەبینین کە دەکرێت بیکەین بەسەرمەشقی گۆڕانکارییەکی گرنگ لە ژیانماندا .

**(عەین)** عومرە. عومرە: عومرەیەك لە ڕەمەزاندا وەکو حەجێك وایە لەگەڵ ئازیزماندا ﷺ (عُمرَةٌ في رمَضَانَ تَعدِلُ حجة أَوْ حَجَّةً مَعِي).[1]

**(فێ)** فێربوون: ڕەمەزان قوتابخانە یان زانکۆیە، هێندەی لێ فێردەبیت کە دەتەوێت، ئینجا دەتوانیت هەر چۆڕاوێك فێربیت و دەشتوانی دە هێندە و سەد هێندە، فێرخوازی زیرەك لەم مانگەدا دەردەکەوێت.

**(ڤێ)** ڤایرۆس: ئەمە لەم ڕەمەزانەدا باسی هەموو ڕۆژێکمان بوو، و زۆر زانیاری لەبارەیەوە فێربووین.

**(قاف)** قورئان: کتێبە پیرۆزەکە، ئەو کتێبەی پڕ خوێنەرترینی جیهانە، هیچ چرکەیەك لەسەر ئەم زەوییە تێپەڕ نابێت کە بەسەدەها و هەزارەها کەس خوێنەری ئەم کتێبەن، ئەمە کتێبی پیرۆزی خودایە. زانیاری تیایدا هەژمار ناکرێت.

**(کاف)** کاروان: ئەم مانگە ئەگەر مێوانیش نەبێت وەکو

---

(1) متفقٌ عليهِ.

کاروانێکـە و تێدەپـەڕێت، دەتوانیـت سـوودت هـەبێت بـۆی، کـە ئەویش لەبەرامبەردا سوودی دەبێت، دەشتوانی...

**(گـاف)** گـەڕان: گـوتراوە ڕۆژوو گەشـت و گـوزارو گەڕانـە، لـە دایکـمان عائیشـەوە گێڕدراوەتـەوە کـە دەڵـێ: (سـیاحة هـذه الأمـة الصیام).[1] واتە: گەشت و گوزار و گەڕانی ئەم ئوممەتە ڕۆژووە.

**(لام)** لێکدانـەوە: لێکدانـەوەو لێکۆڵینـەوە لە زاستەکانی قورئان و گشت لایەنەکانی تر پێویستییەکی ترە، و ئێمەیش لەم ڕەمەزانە چەنـدی بۆمـان بکرێـت درێغـی ناکـەین، و لەهـەر ڕەمـەزانێکیش شتێك فێربین ئەوا زۆر دەکات.

**(مـیم)** مانـگ: وێنـای مانـگ بکـە وەك ئایـەتێکی خـودا، لـەم مانگـەدا هەمیشـە چـاوت لەسـەریەتی! لـە یەکەمـدا کـاتێ کـە تـۆ دەزانیت ئەوا ڕەمەزانە و لە ناوەڕاستدا کە مانگ لە ئاسماندا دەبێتە چواردە لەوپەڕی جوانیدایە، و لەکۆتاییدا کە ساتی ماڵئاواییە.

**(نوون)** نیاز: ئەمە هەر لەسەرەتای ڕەمەزانەوە بەدەر دەکەوێت کـە تـۆ نیـاز و نییـەتت چییـە! ئـاخر هـەر لەبـەر ئەوەشـە وتـراوە کـە ڕۆژوو بـۆ خودایـە، چونکـە ڕووپامـایی تێـدا نییـە. لەهـەر کاتێکـدا بتـەوێت ئـەوەندەت هەل بۆ دەڕەخسێت کـە چۆڕە ئاوێك بخۆیتـەوە، بەڵام کە نیاز و نییەتت ئەوەنەبوو، ئیدی ئەوە گرنگە.

---

(1) ورواه ابن جریر في تفسیره عن عائشة رضي الله عنها، وضعفه أحمد شاکر (رحمه الله) (٥٠٦/١٤).

## بیست و حەفتەم
## بۆچی پێویستە ترەمپ، بەڕۆژوو بێت؟!
## (وەیان بۆچی پێویستە ترەمپ، ئەزموونی ڕەمەزان بکات؟!)

ئەمەی سەرەوە ناونیشانی وتارێکی (کارلی پییەرسن)ـە لە سایتی (ئیندپێندت) لە (٧)ی ئەم مانگە بڵاوبۆتەوە، لەخوارەوە وەرگێڕاوەکەی بە شەکرە زمان دەخەینە ڕوو:

بۆچی پێویستە ترەمپ بەڕۆژوو بێت

مانگی ڕەمەزان بۆ نزیکەی دوو بلیۆن موسڵمان لەسەرانسەری جیهان و بۆ نزیکەی سێ ملیۆن و نیو موسڵمان لە ئەمریکا دەستیپێکردووە، لەم مانگەدا یادی دابەزینی سرووش دەکرێتەوە بۆ سەر پێغەمبەرﷺ.

عادەتەن کۆشکی سپی ساڵانە خوانێکی بەربانگ ئامادە دەکات لە مانگی ڕەمەزاندا، بەڵام ترەمپ لە ٢٠١٧ خۆی دەرباز کرد لەم

خوانە (ڕەنگە لەبەر ئەمە بێت کە لای قورسە ئاهەنگ بگێڕیت بەبۆنەی یادێکی ئایینی ئیسلامی ئەمە لەکاتێکدا ڕێگە دەدات بە ئەوانەی هەڵگری ئەم ئایینەن بێنەوە وڵاتەوە) .

مـن نـازانم ئایـا سـەرۆك ترەمـپ ئەمسـاڵ هـیچ بـەربانگێك ڕێکـدەخات یـان نـا، بـەڵام لام وایـە کـە ئـەو هـیچ بیرۆکـە و زانیارییـەکی نییـە سـەبارەت بـە ڕەمـەزان، وەیـان چـۆن پەیامـە گرنگـەکانی ڕەمـەزان دەگەیـەنێت بـە خێزانـە موسـڵمان و نـا موسڵمانەکان. خەڵکی ئـەمریکا و بەتایبـەتیش ترەمپ لام وایـە کـە بەرەو باشتر دەڕۆن ئەگەر هات و لەساڵێکدا لەم مانگە ڕەمەزانمان تاقی کردەوە.

لەسەردەمی ماوەی سەرۆکایەتی ئۆبامادا، خوانی بەربانگەکە لە ژوورەکەی بینیامین فرانکلین لە کۆشکی سپیدا ڕێکخرا، وەك ڕێزلێنان لە یەکێك لە چالاکوانەکانی ئازادی ئایینەکان. بنیامین لە ژیاننامەکەیدا دەڵێت: "ئەگەر بێت و موفتی قوستەنتینیە بێتە ئێرە و "موحەممەدییـــەت" بڵاوبکاتـــەوە، ئـــەوا بێگومـــان مینبـــەرێك دەدۆزێتەوە بۆئەوەی بانگەشەی تیابکات".

چـەمکی "موحەممەدییـەت" زۆر ڕوون نییـە (چونکـە موسـڵمانان موحەممـەد ﷺ ناپەرسـتن، بـەڵکو وەکـو هـەموو ئایینـەکانی تـری ئیبراهیمیی، خودا دەپەرستن). بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم قسەیەی بنیـامین مانـای بنەمایـەکی ئـەخلاقی گرنـگ لەئـەمریکادا دەخاتـە ڕوو، ئەویش ئەم وڵاتە بەوە جیادەکرێتە کە ژمارەیەکی بەرچاو لە

ئایینەکان و بیرۆکە و مەزهەبەکان تیایدا ئازادی خۆیان هەیە، ئەم ئازادییەش لە دەستوورەکەماندا تۆمار کراوە لەبەشی مافەکاندا.

کاتێك خەریکی وەدەست هێنانی بڕوانامەی بەکالۆریۆس بووم لە ئاداب (خوێندنە ئیسلامییەکان) لە زانکۆی دی بۆل لە شیکاگۆ، لەگەڵ دەستیەك لە کچانی موسڵمان هاوڕێیەتیم پەیداکرد، کە خێزانەکانیان لە ولاتانی باکوریی ئەفەریقا کۆچیان کردبوو بۆ ئەمریکا. ئەوان دەیانبردم بۆ ماڵەکانیان و وەکو خوشکێك مامەڵەیان لەگەڵ دەکردم، و بۆ چەندین جار لەبەربانگدا داوەتیان کردم لە دیپاولڵ، کە تیایدا بەیەکەوە نوێژمان دەکرد و گوێبستی قورئان دەبووین، و لەوێدا من بە تەواوی مانا و ئاڵنگاریی ڕەمەزان فێربووم، نەوەك هەرتەنها ئەوەی لە هەواڵەکان و کتێبەکان باس دەکرێن.

ڕەمەزان زۆر لەوە زیاترە کە تۆ لەپارشێوەوە بەڕۆژوو بیت تاوەکو ئێوارە، ڕەمەزان کاتیی بیرکردنەوەو تێفکرینی قووڵ و خۆکۆکردنەوەیە، هەروەك چۆن نووسەر و توێژەری سویسری «تاریق ڕەمەزان» دەڵێت: فەلسەفەی ڕۆژوو داوامان لێدەکات کە خۆمان بناسین و خۆمان بەڕێوەبەین و خۆمان ڕێکبخەین و باشترینیش ئەوەیە خۆمان ئازاد بکەین، ڕۆژوو واتە: بەدەستهێنانی سەربەخۆیی خۆمان و بەدەستهێنانی ئازادیی".

لەگەڵ ئەوەشدا ڕەمەزان بەستراوەتەوە بە برسێتی، ئەمەش بۆ ئەوەی هەست بە نەبوونی، وەیان بەو نیعمەتانە بکەین کە ڕۆژانە

بۆمان بەردەستن و هەروەها دڵیشمان لای هەژاران بێت، ڕەمەزان واتا لغاوکردنی ئەم کاپیتالیزمەی لەناخی هەریەکێکماندا هەیە، و مۆڵەتێکی مانگانەشە بۆ بازاڕکردنە نا پێویستەکان (مەبەستمان هەر دوکانی سەوزەو میوە نییە، بەڵکو مۆڵە گەورەکە). واتە: وەك مۆڵەت وایە و هێندە پێویستمان بە بازاڕ نابێت. هەروەك چۆن «بوشرای هاوڕێشم» وتی: "ڕەمەزان واتە: هەڵسان ودانیشتن لەگەڵ خێزاندا نەوەك هەر تەنها خۆگرتنەوە لە خواردن و خواردنەوە، بەڵکو خۆگرتنەوەیە لە قسەو بیرو گوفتاری خەراپیش."

ئینجا بۆ ئەوەی بەهاکان ببینیت مەرج نییە تۆ هەر موسڵمان بیت، باشتر وایە ئەم مانگە تاقیبکەیتەوە و دابڕێیت لە کۆمەڵگایەکی ماددیی و حیزبی کە لەوەتەی ترەمپ هاتۆتە سەر حوکم خراپتریش بووە، ئەم مانگە تاقیبکەرەوە و ئیتر بوەستە لە بارەی ئەوەی دەیڵێن و دەیکەن، ئەوەی دەیکرین و دەیخۆین، لەوەی کە چۆن مامەڵە لەگەڵ خەڵکی دەکەین، ئەمە ئەزموون و ڕاهێنانێکە کە پێویستە هەمووان سوودی لێببین.

بێنە بەرچاوت ئەگەر نا موسڵمانان، بە (ترەمپ)یشەوە، بڕیاراندا بەدڵی فراوان، و خۆ ڕێکخستن و خۆشەویستییەوە ئەم مانگە ئەزموون بکەن! ئەمە ئەگەرچی ڕوونادات، بەڵام ئایا شتێکی جوان و گرنگ نەدەبوو؟ بۆیە هەمووومان دەکرێت لەیەکتر فێرببین.

ڕەمەزان نموویەکی باڵایە بۆ وەرگرتنی وانەیەکی ڕۆحیی و مرۆڤدۆستانە، ئێستا لە هەموو کات پتر پێویستمان پێیەتی.

# بیست و هەشتەم
# ڕەمەزان لە مالیزیا

وڵاتـــی مالیزیـا دەکەوێتـە نێـو جەرگـەی ناوچـەی باشـووری ڕۆژهـەڵاتی ئاسـیا، لـەلای خۆرئـاوای ئەندەنوسـیا هەیـە، لـەلای ڕۆژهـەڵاتیش مەملەکـەتی بڕۆنـای (دار السـلام) و هـەروەها لـە بـاکووریش سـەنگافورە، و لـەلای باشـووریش تایلانـد. ژمـارەی دانیشـتوانی زیـاتر لـە ٣٠ ملیـۆن کـەس دەبێت. ڕووبـەری گشـتی دەگاتـــە(٧٣٣،٣٢٩)کیلۆمـــەتری چوارگۆشـــە. وڵاتـــی مالیزیـــا دانیشتوانەکەی زۆری موسڵمانن و ژمارەیان زیاتر لە ١٦ ملیۆن لە کـۆی هـەموو دانیشـتوان، و هـەروەها نزیکـەی (٢٥%) چینیـە بوزییەکانی تێدا دەژین، و لە (١٥%)ەش هیندۆسەکان، و هەروەها چەندین ئایین و مەزهەبی تریش. ئیسلام ئایینی فەرمی دەوڵەتە لە مالیزیـا، و سـەرۆکی وڵاتـیش لـە موسـڵمانانە، و ئـەم گەلـە بـەوە ناسـراون کـە زۆر ڕژدن لـە ئـایین دا و پارێزگـاریش لـە کلتـووری خۆیان دەکەن.

هـەموو سـاڵێك گـەلی مـالیزی پێشـوازی لـە مـانگی ڕەمـەزان دەکـەن بـە خاوێنکردنـەوەی مزگەوتـەکان و ماڵـەکان، و هـەروەها ئافرەتان لە وچان دان بۆ دابینکردنی سەرجەم کەل و پەلی پێویست وەك پێشوازییەك لەم مانگە.

لـەئێوارەی بیسـت و نـۆی شـەعباندا کۆمـەڵێك کۆدەبنـەوە بـۆ بینینـی هیلالـی مـانگی ڕەمـەزان، بـۆ ئـەم مەبەسـتەش وەزیـری کاروبـاری ئـایینی هەڵدەستێ بـە ڕاگەیانـدنی ئـەم مانگـە، و هـەر کاتێکیش مانـگ بینرا ئەوسا بەشێوەیەکی فەرمی لە کەناڵەکانی ڕاگەیانـدن دەسـتپێکی مـانگی نـوێ ڕادەگەیـەنرێت. موسڵمانان بـە هەواڵی هاتنی ئەم مانگە دڵخۆش دەبن، و تیایدا منداڵ و پیاو، و ئافرەت، و گەنجان هەموو دەچن بۆ مزگەوت، و نوێژی بەکۆمەڵی تەراویح دەکەن.

هـەر لەگـەڵ ڕاگەیاندنی دەستپێکی ئـەم مانگە شارەوانییەکان هەڵدەسـتن بـە پاککردنـەوەو شـوتنی شـەقامە سـەرەکییەکان و هەروەها ڕازاندنەوە و ڕووناککردنەوەیان .

موسـڵمانانی ئـەوێ پیرۆزبـایی لەیـەکتر دەکـەن و زۆر لـە دوکانـەکان لافیتـە هەڵدەواسـن و تیایـدا پیرۆزبـایی هـاتنی ئـەم مانگەی لێ نووسراوە وەکو (شهر مبارك) وەیان ئەم ئایەتە (شهر رمضـان الـذي أنـزل فيـه القـرآن هـدى للنـاس وبينـات مـن الهـدى والفرقـان)، و هـەروەها چەنـدین شـتی تـریش، کـە زۆربـەی جـار بـە زوبـانی عەرەبیشـە! هـەروەك چـۆن هـەموو مینـارەی مزگەوتـەکان بەدرێژایی شەو ڕووناکن و تیایدا مژدەی هاتنی ئەم مانگە دەدرێن.

بـەڵام لـە گوندەکانـدا، موسـڵمانان بـە کۆبوونـەوە لـە مزگـەوت پیرۆزبـایی لـە یـەکتر دەکـەن و بـە دوقێکـی گـەورە ئەمـە ڕادەگەیەنرێت.

مزگەوتەکانیش لە مالیزیا بەدرێژایی ئەم مانگە پیرۆزە لە شەو و ڕۆژدا ئـاوەڵان و هـەرگیز دانـاخرێن، کـە ئەمـەش جیـاوازە لـە تـەواوی سـاڵەکە، نزیـك بـە ئێـوارە هـەبووەکان شـت لـە خـواردن و خواردنەوە دێنن و لەسەر سفرەی درێژ دادەنرێن و بۆ هەمووانە.

دوای تــەواو بــوونی نــوێژی مــەغریب، نوێژخوێنــان دەچنــەوە ماڵەکانیان تاوەکو ژەمی سەرەکی لەگەڵ خانەوادەکانیان بخۆن، و پاشانیش هەموو دەچنەوە بۆ مزگەوت بۆ نوێژی خەوتنان و نوێژی تەڕاویح.

شتێکی تر کە جێگای ئاماژەیە، ئەوەیە کە بەدرێژایی ئەم مانگە لـە مزگەوتەکانـدا بخـوور دەسـوتێنرێت و هـەروەها جـار جـارەش بـە عـەترو گـوڵاو مزگەوتـەکان بۆنخۆش دەکـەن وەکـو ڕێزلێنـان بۆ ئـەم مانگــە، ئینجــا دوای نــوێژی خــەوتنان و تــەڕاویح، دیســانەوە بــۆ شــەونوێژ لــە مزگەوتەکانــدا کۆدەبنــەوەو پاشــانیش دەســت بــە خوێندنــەوەی قورئــان دەکــەن بەکۆمــەڵ و هــەروها بــە تــەنهاش. پاشـانیش لـە میوەجـات و یـان شـیرینی دەخۆن، لـەوەی کـە حـەزی پێدەکـەن. ئەنداماني خێـزانیش لـەم مانگـەدا هەموویان وەك ئـەوەی بلێــی کاریــان ببێتــە پەرســتش، هــەر لــەڕێگای مزگــەوت و خوێندنەوەی قورئانن.

شـتێکی تـریش کـە تێبینـی دەکرێـت ئەوەیـە گـەنجان لم مانگـەدا جلی کلتـووری خۆیـان دەپۆشـن و کـڵاو لەسـەر دەکـەن، و کچـانیش جلی درێژ و باڵاپۆشی دەپۆشن.

حکومـەت لەوێـدا گرنگیـی تـەواو بـەم مانگـە دەدات و هـانی هاوڵاتیـان دەدات کـە بەرهـەم و چالاکیـان هـەبێت و بـۆ ئـەم مەبەستەش خەڵاتییان پێدەبەخشێت.

کەناڵـە ئایینییـەکان لـەم وڵاتـە هەڵدەسـتێت بـە ئامـادەکردنی بەرنامەی تایبەت بە مانگی ڕەمەزان، کە بابەتەکانیان بریتیە لە ژیاننامـەی پێغەمبـەر ﷺ و ژیاننامـەی هاوەڵان و ئـەحکامی فیقـە و تەفسیرو خوێندنەوەی قورئان و چەندان پێشبڕکێ و چالاکی تر...

شتێکی تر کە خێزانەکان لەم وڵاتە لەگەڵی ڕاهاتوون ئەویش گۆڕینەوەی خەڵات و دیاری و هەروەها پێشکەشکردنی شیرینییە لەگـەڵ یەکتریـدا وەك گەورەییـەك بـۆ ئـەم مانگـە و هـەروەها زیادبوونی خۆشەویستی لەگەڵ یەکتردا.

هـەروەها مزگەوتـەکان جمـەیان دێـت لـە نوێژخوێنـان، و بەتایبـەتیش هـەردوو نـوێژی خـەوتنان و نـوێژی بـەیانی. هـەروەها زۆربـەی جارانیش وانـەی ئایینی و دەرسـی گرنـگ لـەدوای نـوێژی بـەیانی پێشـکەش دەکرێت، و ئـەم دەرسانەش تـاوەکو ڕۆژهـەڵاتن بەردەوام دەبێت، دوایش هەریەکەو بۆ سەر کارو کاسبی خۆی تژی لـە چـالاکی هـەنگاو دەنـێن و دەڕۆن، کـە تیایـدا زۆربـەی خـاوەن کـاران لـەم مانگـەدا هێندە دۆستی خـەوتن نـین و ناخـەون و بـەڵکو هەرزوو دەست بەکار دەکەن.

لەگـەڵ نزیکبوونـەوەی بـانگی شـێوان، پیـاوان و منـدالان لـە

نـــزیکترین مزگـــەوت کۆدەبنـــەوەو لەوێـــدا بـــەربانگ دەکەنـــەوە و ئافرەتـانیش لەماڵـەوە بـە ئامـادەکردنی خـواردن و خواردنـەوەکان لـە ماڵەوە بەربانگ دەکەنەوە، و پاشان نوێژی دەکرێت و دەڕۆنەوە بۆ ماڵەکانیان تاوەکو لەگەڵ خانەوادەکانیان ژەمی سەرەکی بخۆن.

ژەمی خواردن لە مالیزیا هەمەجۆرە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا برنج ژەمی سـەرەکییە و هەمیشـەییە و لەگەڵیشـدا گۆشـتی سـوور وەیـان مریشك ئامادە دەکرێت.

هەروەها دوای خواردنیش هەمووی حەزی لە قاوە یان چایەکی سووکە (ڕوون).

دوای نـانی ئێـوارە هـەمووی ڕوودەکاتـە مزگەوتـەکان بـۆ نـوێژی خـەوتنان و تـەڕاویح، لـە مالیزیـا لەزۆربـەی مزگەوتـەکان بیسـت ڕکات نوێژی تەڕوایح دەکرێت، و ئینجا ژن و پیاو، و منداڵ و گەنج و پیر تیایدا بەشدارن.

دوای نوێژ، کۆڕی زانستی و حەلەقاتی قورئان دەست پێدەکات و کە هەموو لەم جۆرە کۆبوونەوانە دا بەشدار دەبن و بۆ بیستنی وانـەی شـەرعی لەزانایان. زۆربـەی ئـەم حەلەقانـەش لـە نزیکـی نیوە شـەو کۆتـایی دێت و ئینجـا خـەڵکانێك دەچنـەوە بـۆ ماڵـەکانیان بـۆ پشوودان و خەڵکانێکیش بۆ خوێندنەوەی قورئان دەمێننەوە.

ئێستاشـــی لەگەڵـــدا بێـــت مالیزییـــەکان گرنگـــی دەدەن بـــە دۆڵـەنگێوانی پارشـێو (المسـحراتی) کـە لـەزۆر لـە شـارۆچکە و

گوندەکاندا هەن لەسەرەتای ڕەمەزان تاوەکو کۆتایی، لە هەموو گەڕەکەکەدا دەگەڕێن و خەڵکی خەبەر دەکەنەوە بۆ خواردنی پارشێو، ئەمەش نزیکەی کاتژمێرێك بەر لە پارشێو.

هەروەها عادەتێکی تریش ئەوەیە کە دوای خواردنی پارشێو، خواردنەوەیەك دەخۆن پێی دەگوترێت (کولاك)، کە خواردنەوەیەکە یارمەتیت دەدات لە تینوو نەبوون، و تینوێتی لەسەر جەستە هەڵدەگرێت لە ڕەمەزاندا، و باوەڕوایە کە ئەوەی دەیخوات یارمەتی دەدات و بەهێزی دەکات بۆ ڕاییکردنی کارەکانی.

زۆربەی مزگەوتەکان لەم مانگەدا پێشبڕکێی قورئان و بابەتی زانستە ئیسلامییەکان ڕێکدەخەن وەکو فیقە و فەرموودە و تەفسیر... کەتیایدا گەنجان و کوڕان و کچان هەموو بەشداری تێدا دەکەن، لەلایەن وەزارەتی کاروباری ئایینیش ڕێزیان لێدەگیرێت و خەڵات دەکرێن و ئەم ڕووداوانەش لە کەناڵ و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان دەگوازرێنەوە.

هەروەها لە دە شەوی کۆتایی ڕەمەزانیش مزگەوتەکان قەرەباڵغی زۆریان پێوە دیارە، خەڵکانیکی زۆر بۆ پەرستش و ئیعتیکاف ڕوو دەکەنە مزگەوتەکان. بەجۆرێك مزگەوتێك نییە کە قورئان خوێنێك، وەیان نوێژخوێنێك و یان کەسێکی بۆ ئیعتیکاف تێدا نەبیت.

هەروەها وەکو لەسەرەتاش ئاماژەمان پێدا کە لەمالیزیا

خەڵکانی نا. موسڵمانیش هەن، کە ئەوانیش لەگەڵ موسڵمانان ڕێزی ئـەم مانگـە دەگـرن و بـە ئاشـکرایی نـاخۆن و ناخۆنـەوە، و شـتانێك ناکـەن کـە هەسـتی موسـڵمانان بریندار بکـەن، و تەنانـەت هەنـدێك جاریش کۆمەڵێك لەو خەڵکە نا- موسڵمانە هەڵدەستن بە بەشداری لـە چالاکییـەکانی موسـڵمانان. موسـڵمانانیش ئەمـە بەشـتێکی زۆر چاك دەزانن بۆ مەسەلەی بانگخوازی و ئاگادار بوون لە ئیسلام.

لەگــەڵ نزیکبوونــەوەی کۆتــایی مــانگی ڕەمــەزان و جــەژن، کۆمــــەڵێك لــــەدەرچووانی پــــەیمانگا ئایینییــــەکان و هــــەروەها قوتابخانـەکان هەڵدەسـتن بـە دروسـتکردنی لیژنـەو کۆکردنـەوەی زەکاتی سەرفیترە و پاشان بەسەر ماڵە هەژارەکاندا دابەشی دەکەن، و هەندێك لە چاکەکارانیش جلوبەرگی نوێ بۆ جەژن دەبەخشنەوە، لەگەڵ شیرینی جەژن و هەندێك پارە بۆ هەژاران، هەموو ئەم شتانە لە کەشێکی ئیمانی و برایانەدا بەڕێوە دەچێت، کە ئەمەش بەڵگەیە بەسـەر سـۆزداریی نێـوان موسـڵمانان لـە وڵاتـەدا، کـە هـەموو بـە نزیکبوونەوەی جەژن، دڵخۆش و کامەران دەبن.[١]

---

(١) . سەرچاوە بە زوبانی عەرەبی: ئیسلام وێب.

# بیست و نۆیەم
# ڤاكسینی ڕەمەزان و شتی تریش...

ئیتر ئەوا چوو، بەڵام ئێمە هەروا واین لە شوێن خۆمان، جاران دەیانگوت لەدوای ڕەمەزان دیسانەوە تۆز و غوبار دەگەڕێتەوە سەر قورئانەكان، بەڵام ئێستا هەر هێندە نییە، بەڵكو ئێمە ترسمان لەوەیە كە تۆز و غوبار بگەڕێتەوە سەر جەستەو ڕۆح و دڵمانەوە، دیسانەوە لەم كەسە چالاكە بگەڕێینەوە سەر تەمبەڵییەكەی جاران و بێ بەرهەم و بێ سوود لێی پاڵكەوین!

ڤاكسینی ڕەمەزان هیچ نەبێت بۆ ساڵێكە، و تا دەگاتەوە ڕەمەزانی تر دەبێت و پێویستە كە ئەم ڤاكسینە ژەهری تەمبەڵی لەجەستەدا بكێشێتە دەرەوە .

لەیەكێك لە زنجیرەكانی ڕەمەزاننامە (ئوممەتێكی چالاك)، باسی ئەوەمان كرد كە چۆن ئێمە لە ڕەمەزاندا كەسانیكی هێندە چالاكین، و بەجۆرێك نوێژەكانمان بەكۆمەڵ دەكەین و تەراویح و شەونوێژ و خوێندنەوە و دەوركردنەوەی قورئان و چەندانی كاری تر، ئەمە جگە لەكارەكانی ماڵ و گوزەران و ژیان بەگشتی، و جگە

لـە ئەرکـەکانی خۆمـان و کـارو کاسـبی و دەوام، هێشـتاش وزەی زیـاتر شـك دەبـەین و گەرەکمانـە کـاری زیـاترو زیـاتریش بکـەین، ئەمانـە هـەموو تایبـەتن بـەم ڤاکسـینی ڕەمەزانـە، کـە لەسـەرەتای هەموو ڕەمەزانێکدا دەبێت جورعەیەك وەرگرین، ئەم ڤاکسـینەش تاوەکو ڕەمەزانێکی تری درێژەی دەبێت و بەهیچ جۆرێك جارێکی تر بۆمان نییە بگەڕێینەوە سەر ئەم ژیانە بێ بەرنامەیەی پێشوو، و بـەڵکو لـەوەش زیـاتر لـە دوای ڕەمـەزان کـە کۆمـەڵێك پەرستشـی وەکو تـەڕاویح و کۆمەڵیك ئەرکی تری تایبەت بە ڕەمەزان تـەواو دەبـن، ئیـدی کـارە گرنگـەکانی تـر جێگـەیان دەگرێتـەوە، وەکـو هەوڵدان و خۆ-خوێندنەوەو پلان و شارەزایی لەپسپۆریی خۆت و شتی تریش، ئەمانە هەموو جێگەی کارەکانی تر دەگرنەوە، نەوەك ئـەو کاتـەی بـۆت دەمێنێتـەوە بیکـەیت بـە کـەلێنێك بـۆ دزەکردنـی ژەهری زیاتر و نا. چالاککردنی ئەم ڤاکسینە!

# ڕەمەزاننامە سێیەم
# ئەوا کۆچی کرد مانگی ڕەمەزان

لوتفی شاعیر، شیعرێکی هەیە بەناوی (ئەوا کۆچی کرد مانگی ڕەمەزان) لە ساڵی ١٩٦٥ نووسیویەتی بەشێوەی دە بڕگەیی. بەر لە هەموو شتێ با بچین بە لای دەقی شیعرەکەوە:

ئەوا کۆچی کرد مانگی ڕەمەزان

ئەو کەسەی خواردی ئەو بوو پەشیمان

بێ بەش لە خەیری ڕۆژوو بوو ئەو کەس

ئەو ڕەنج خەسار بوو لە هەر دوو جیهان

جەژنە ئەوا هات بە خۆش و شادی

یاخوا بە خێر بێ جەژنی موسڵمان

خوایە بە شەرەف حەزرەتی ڕەسووڵ

ئەمن و ئاسایش بۆمان کەی نیشان

ئەوەندەی توانیم هەوڵم تیاداوە
بە ویرد و نوێژ و خوێندنی قورئان
گەرچی گوناهم وەک چیا وایە
بەڵام ڕەحمی تۆ بێ حەد و پایان
دەسەڵات لە دەس بەندە چی هەیە
غەیر ڕجا کردن لە دەرگەی یەزدان
خۆزگە بەو کەسەی ئەکەوێتە بەر
شەفاعەتی ئەم مانگەی ڕەمەزان
مەغفیرەت بۆ ئەو دێتە خوارەوە
سەر بەرز و دڵ خۆش لە هەردوو جیهان
من ماڵ کاوڵم زۆر بار گرانم
لە ئەمر و نەهی زۆرم هەن نوقسان
لوتفی بگریە مەخەو ڕۆژ و شەو
بناڵە بۆ خۆت شەو هەتا بەیان

لێرەدا لوتفی شاعیر، بە سەلیقەیەکی جوان باسی کارو کردەوەکان دەکات لەم مانگە و هەروەها باسی کۆچی ئەم مانگە

دەکـات و هیواخـوازە ئـەم مانگـە ببێتـە ڕجـاو تکاکـاری، یـانی مەبەسـتی کـە پەرستشـەکانی وەربگێـرێن. تـۆ سـەرنج بـدە ئێمـە مێوانێکمان هات، و داوامان لێکرا کە ڕێزی لێبگرن، دەی ئێمەیش پشـتیوان بـەخودا درێغیمان نـەگرت، بـەڵام ئایا ئـەم ڕێزو تەقدیرەی هەریەك لەئێمە لەلایەن خوداوە گیرابووە؟!

جاران پیرەکان دەیانگوت ئەوا مانگی ڕەمەزانیش چوو، ئەوەی گرتوویـەتی و ئـەوەش نـەیگرتووە هـەروەك یـەکن! دیـارە مەبەستی ئـەوان ئـەوە بـوو کـە ئەوانـەی بـەڕۆژوو بـوون لـە جەسـتە و مـان و نەمانـدا هـەروەك ئـەوانی تـرن هیچێکیـان لێنـەهاتووە، سـادەتر یـانی ئەگەر تۆ ڕێزی ئەم مانگەت نەگرتووە ئەوا خەسارەتمەندبوویت! تا چەنـد بـەر لـە هەفتەیـەك خـەریك بـووین پێشـوازیمان لێدەکرد و ئـەم ئێســـتاش وا چـــوو، لەکوردســـتان عادەتـــەن لـــە دوای پـــازدەی ڕەمەزانـەوە (الـوداع الـوداع) دەکرێـت، و خـەڵکیش لـەم شـەوانەی کۆتاییدا زیاتر ڕوو دەکەنە مزگەوتەکان و پەرستشەکان بەکۆمەڵ لە مزگەوت دا دەکەن. جاریێ ڕۆژی بەر لە دوایی، کە بەهەڵە پێی دەگوترێـت: عارفــە، عەرەفــە، عالفــە... خــەڵکان و خانــەوادەکان منداڵەکانیشیان هان دەدەن بەوەی بەڕۆژوو بن...

باقییەکەی دەگەڕێتەوە سەر خۆتـان، ئەگەر مێـوانێکی هاودەم بـوون و بەیەکـەوە کـاتی پـڕ لـەچێژتان تۆمارکرد و تـامی شـتانێکتان کـرد، کـە نـاگوترێن و نانووسرێن، ئـەوا ئیـدی بێگومـان ئێسـتا هـەم دڵتــەنگ و هــەمیش دڵخــۆش دەبــن. دڵتــەنگ بــەوەی ئازیزێکــت

دەڕوات و دڵخۆشیش بەوەی هیچ درێغیت نەکرد لە خزمەتکردنی ئەم ئەزیزە.

لەکۆنەوە گوتراوە، چەندە سەیرە ڕەمەزان هەرچەند مانگێکیشە، بەڵام هێندە زوو ڕادەبوورێت و لەکاتێکدا مانگەکانی تری ساڵ هێندە لەسەرخۆن.

## ڕۆژی جەژن لە ئەسڵدا ڕۆژی مانگی شەواله!

سبەی کە یەکەم ڕۆژی جەژنی ڕەمەزانە، لە ئەسڵدا یەکەم ڕۆژی مانگی شەوالە (شەشەڵان – شەشەران). بەڵام دیارە کە ڕەمەزان ئەم ڕۆژانەشی بۆخۆی بردووە! ئینجا لە نێو دونیای ئەدەبیاتدا زۆر دەقی جوان و ناوازە هەن ئەم حاڵەت دەردەبڕن و وێنای دەکەن، هەندێك باس لەگەورەیی ئەم مانگە دەکەن و گوایە دەڵێن بۆ گەورەیی مانگەکەیە بۆیە ئەم ڕۆژانەیش هەر بە جەژنی ڕەمەزان ناسراوە، هەندێکی تر لە شاعیران لەغەزەلەکانیاندا باسی ئەم جۆرە بردنەیان کردووە و شوبهاندوویانە بەشتی تر کە ڕەنگە لێرە دەرفەت نەبێت چەند نموونەیەك بهێنینەوە.

## جەژن لە زمانەوانیدا

وشەی جەژن (عید) لەفەرهەنگەکاندا کۆمەڵێك مانای هەیە،

لەوانە بەمانای (گەڕانەوە) یان (گەڕاوە) دێت، هەروەها بەمانای گەڕانەوەی خۆشی و شادی ساڵانە دێت، وەکو موتەنەبی شاعیر لەیەکێك لە قەسیدەکانیدا دەڵێت: "عيد بأية حال عدت يا عيد". (معجم الغنی).

### خواردن

لە ئیسلامدا، و لە جەژنی ڕەمەزاندا، بەر لەنوێژی جەژن ئازیزمان ﷺ چەند دەنکە خورمایەکی دەخوارد ئینجا دەچوو بۆ مزگەوت، ئەوە بەپێچەوانەی جەژنی قوربان کە دوای هاتنەوە ئینجا نان دەخورا، بەڵام لە کلتووری کوردەواریدا، ئیتر هەر لە بەرەبەیانەوە و ئامادەکاری دەکرێت و چەندین جۆر چێشتی جیاواز ئامادە دەکرێت، بۆیە هەر کاتێك سفرەیەکی ڕازاوە دەبینرێت کورد دەڵێ "دەڵێی جەژنە".

## جەژن لە ئەدەبیاتی کلاسیکی کوردیدا (جێژن)

جەژن (جێژن) لەئەدەبیاتی کلاسیکی کوردیدا بەشێوەیەکی بەرچاو دەرکەوتووە، و شاعیرانمان ئەوپەڕی داهێنانی خۆیانیان تێدا تۆمار کردووە، بەڵام لەم کورتە گەڕان و توێژینەوەماندا بۆمان دەرکەوت کە زۆربەی ئەم شیعرانەی وشەی (جەژن)ی تێدا بەکاربراوە، تایبەتن بە جەژنی قوربان، وەیان نەورۆز، و بەتایبەتیش جەژنی قوربان ژمارەیەکی زۆر شیعری لەسەر

نووسراوە، ئەمە لەکاتێکدا وەکو ئاماژە، بۆ جەژنی ڕەمەزان ئەوا دەبینین تای تەرازووەکە زۆر لاسەنگە، بەوەی بەدەگمەن نەبێت شیعر لەسەر جەژنی ڕەمەزان نادۆزیتەوە! (داوا دەکەم هەر کەس هیچ شتیك شك دەبات لەئەدەبیاتی کلاسیکی خۆماندا بۆمان دابنێت سوپاسی بێ پایانی دەکەین)، هەرچۆنێك بێت، مەلا مستەفای عاسی (١٨٨٥. ١٩٧٥) قەسیدەیەکی هەیە (مانگی ڕەمەزان ڕۆیوە جێژنی ڕەمەزان هات) لەمبارەیەوە بەمجۆرە باسی حاڵی کوردان دەکات، وەك ئەوەی وێنای ئێستا بکات، چوون هەر لەم سەردەمەوە کورد هەر وەك ئێستا پەڕاکەندووە و سەرلێشێواو جاشدار و میحننەت دۆست بووە، فەرموون لەگەڵ قەسیدەکە:

مانگی ڕەمەزان ڕۆیوە جێژنی ڕەمەزان هات

هەر کوردی جەفا دیدە کەوا تووشی خەتەر هات

قەومێکە جگەرپارە بەسەر پەنجەیی ئەغیار

ئیمڕۆ کە پەراگەندەیە کەوتۆتە وەڵات

تەییارە خەتیبە، لە هەوا تۆپە مەئەززین

هەر دۆشکەیە دەسڕێژی ئەکا گوللە بە چوکلات

ئەلغامە لە جێی تۆپی بەشارەت کە ئەتەقێ

دەبابە ئەلوورێنی دەڵێ کوردە ئەجەل هات

تیزابە لە جێی شەربەت و شەکراوە پلاومان

هەرساتە لەناو ئێمە کە پەخشانی ئەکات

دەست ڕێژە لە هەر لاوە بە هەر نوعە چەکێکی

سەد جاشە کە نامەردە هجوومی کە دەکات

فورسەتە تۆش هو جاشە کەرەی ئەهلیی وڵات

سەیری بکە چۆن دوژمنی تۆ هەڵدەپەڕێ

دوو جێژنەیە ئیمڕۆ کە لەلای ئەهلی خەرافات

ئەلئان پڕە ئەو دەشتە لە چەند لەشەیی جاشی

گورگ و چەقەڵ و ڕێوییە ئەولاشەیە ئەخوات

نێزیکە کە عاسی لە خەفەت ئێوە بفەوتێ

بوونەتە چەند فرقەیی بێهۆش وجونات

**تەکبیراتی جەژن**

(الله أكبر، الله أكبر، الله أكبر لا إله إلا الله، والله أكبر، الله أكبر، ولله الحمد) ئەمە تەکبیراتی جەژنە، و لە هەموو جەژنێکدا دەنگی ئەم تەکبیراتە دڵی هەموانی هێناوەتە جۆش و غەمی بە خۆشی گۆڕیوەتەوە. لەمنداڵیدا ئێمەی منداڵانی کۆڵان بەیەکەوە کۆدەبووینەوە و سپێدە زوو دەچووین بۆ مزگەوت و تەکبیراتمان دەکرد، و هەر هەموویشمان حەزمان لێبوو کە بگەین بە

مایكرۆفۆنەكـە، و زۆرجـاریش بازنـەیان پێـدەكردین و لـەدەوری مایكرۆفۆنەكـە كۆدەبووینـەوەو دەسـتمان دەكـر بـە وتنـەوەی ئـەم تەكبیراتـە، بەشـێوەیەكی بـەرچاویش لەهـەردوو جەژنـدا قاریئـەكان (سـوورەتی ڕەحمن)ـیان دەخوێند. جیـاوازی ئـەم تەكبیراتـە لەگـەڵ ئـەوەی جـەژنی قوررـبـان هـەر ئەوەیـە، كـە لـە جـەژنی ڕەمەزانـدا لـەدوای نـوێژی بەیانییـەوە دەست پێـدەكات و دوای نـوێژ كۆتـایی دێـت. ئەمـە لەكاتێكـدا لـە جـەژنی قوربـان بـەدرێژایی هـەر چـوار ڕۆژەكە تەكبیرات دەكرێت.

### شەوی جەژن

شـەوی جـەژن، شـەوێكی تایبـەت بـوو، بـۆ سـەردەمی منـاڵی، بێگومـان هەریەكـەو لەگـەڵ جلـی جەژنەكـەمان دەخـەوتین و جلـی كـوردیش تاكـە جلـی دڵخـواز بـوو بـۆ جـەژن، ئێمـەی كـوڕانیش گەورەترین كێشەمان لەگەڵ (پشدێن) بوو.

### جەژنانە

كۆكردنـەوەی جەژنانـە خۆشیە هـەرە گەورەكـەی ئـەم ڕۆژە بـوو، هەریـەك لەئێمـە چەنـدین ئـەم پارانـەمان سـەرلەنوێ دەژماردەوە كـە كۆمان كردبووەوە.

# کۆتایی

لێرەدا ئەوەی لە هەگبەماندا بوو سەبارەت بە ڕەمەزاننامە خستمانە ڕوو لەماوەی ڕابردوو، بەهیوای ئەوەی توانیبێتمان مشتێ لە خەرمانێك پێشکەش بکەین هەر لە زنجیرەی (سفر)ەوە تاوەکو ئەم کۆتاییە کە زنجیرەی (٣٠)یە، داوای لێبوردنمان هەیە لەهەر هەڵەو کەم کوڕییەك، خودا ئێمە و ئێوەش ببەخشێت. ئێمەش ئەم ئایەتەی خودا دەڵێینەوە: "پەروەردگارا؛ لێمان مەگرە ئەگەر فەرامۆشیمان بەسەردا هات یان گوناهو هەڵەیەکمان لەدەست قەوما، پەروەردگارا؛ ئەرکی سەخت و کاری گران مەدە بەسەرماندا وەکو ئەوەی داوتە بەسەر ئەوانەی پێش ئێمەدا، پەروەردگارا؛ ئەرکێك مەدە بەسەرماندا لەتوانامان‌دا نەبێت، تووشی بەڵاو ناخۆشیەکمان مەکە تواناو هێز و هەناومان لێ ببڕێت، گوناهمان بسڕەوەو چاوپۆشی بکە لە هەڵەو تاوانەکانمان و دای پۆشە (داواکارین) بەزەییت بێتەوە پیاماندا، ڕەحمان پێ بکە، هەر تۆ پشت و پەنای یاریدەدەری ئێمەیت..." (البقرة: ٢٨٦).

تاعەت و ڕۆژووی هەموو لایەکتان قەبووڵ و جەژنتان پیرۆز

# ناوەڕۆك